# من و خەسووم



کۆمەڵێک چیرۆک و پەند و ئامۆژگارییە
لە ژیانی هاوسەر لەگەڵ خەسوودا



نوسینی: د. محمد ابراهیم صقر
وەرگێرانی: ناصح محمد شاربازێری

چاپی یەکەم
٢٠٠٩ز
١٤٣٠ک

# من و خەسووم

کۆمەڵێ چیرۆک و پەند و ئامۆژگارییە لە ژیانی هاوسەر لەگەڵ خەسودا

نوسینی: د. محمد ابراهیم صقر
وەرگێڕانی: ناصح محمد شاربازێڕی

چاپی یەکەم

٢٠٠٩ زایینی ١٤٣٠ کۆچی

- ناوی کتێب: من و خەسوم.
- نوسینی: د. محمد ابراهیم صقر.
- وەرگێڕانی: ناصح محمد شاربازێڕی.
- پیت چنین و دیزاین: کۆمپیوتەری یاد.
- نۆبەی چاپ: یەکەم.
- ساڵی چاپ: ٢٠٠٩ زایینی - ١٤٣٠ کۆچی
- تیراژ: (٥٠٠) دانە.
- لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی هەورامان.




ژمارەی سپاردنی (١٥٤٦)ی ساڵی ٢٠٠٩ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

قال تعالى :

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾ لقمان ١٤

قال تعالى :

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم ٢١

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إنّ الله يوصيكم بأمهاتكم، ثم يوصيكم بأمهاتكم، ثم يوصيكم بأمهاتكم، ثم يوصيكم بآبائكم ثم يوصيكم بالأقرب فالأقرب)صحيح ابن ماجه.

قال عليه السلام: (الدنيا متاع و خير متاع الدنيا المراة الصالحة) صحيح مسلم.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهان، کە لە ئاو مرۆڤی بەدیهێناوە و چەندین وەچە و پشتی لێکردۆتەوە، خوایەك بە توانایە لەسەر هەموو شتێك، یەکێك لە دەسەلاّت و ئایەتەکانی ئەوەیە لە خۆمان هاوسەری بۆ دروست کردووین تا لەگەڵیان ئارام بگرین و سۆز و بەزەیی و میهرەبانی خستۆتە نێوانمان، سوپاسی زۆری ئەو پەروەردگارە دەکەین.

شایەتی ئەدەین لەسەر تاك و تەنهایی خوا و بێ هاوەڵی، شایەتی لەسەر پێغەمبەرێتی (محمد)ﷺ دەدەین، کە باشترین کەسێکە بەسەر زەویدا رۆشتبێ، پەروەردگارا صەلاوات بدەی لەسەر ئەو پێغەمبەرە و ئال و بەیت و یارانی.

پاشان خێزان بەردی بناغەی دروست کردنی کۆمەڵگایە، لە دوو هاوسەر پێك دێت کە خوا سۆز و بەزەیی خستۆتە نێوانیان، بۆیە لە قورئاندا و لەزۆر ئایەتدا باسی خێزان و بنەماکانی و

ئامۆژگاری خوا و پێغەمبەرﷺ بۆ هاوسەران کراوە، هەروەها ئامۆژگاری و فەمان کراوە بە چاکەکردن لەگەڵ باوك و دایکدا.

لەگەڵ فەرمانی چاکە لەگەڵ هاوسەر و دایك و باوکدا پێویستە هاوسەر ئەوا دوو فەرمانە جێبەجێ بکات، چونکە هەریەك لە خێزان و باوك و دایك مافیان هەیە.

جا هەندێ کەس ئەتوانێ هاوسەنگی لە نێوان ئەم مافانەدا بکات و هەر کەس مافی خۆی پێ ببەخشێت، هەندێ کەسیش زیادە ڕەوی دەکات و مافی هاوسەر پێش دەخات بەسەر مافی دایك و باوك، یان مافی دایك و باوك پێش دەخات بەسەر مافی هاوسەر، لێرەوە جیاوازی و کێشە سەر هەڵدەدات و ژیان بەرەو لێڵی دەڕاوت، بۆیە دەبینین ژیان پڕ بووە لە کێشە و گرفت، بەهۆی مامەڵەی هاوسەر لەگەڵ خەسوو و خەزوردا، ئەمەش بەرەو پەراگەندە بوونی خێزان و زۆری جیابوونەوە ڕۆیشتوە.

ئەم دیاردەیەش لە کاتی لاوازی بواری ئیمانی یان ئابوری بەرەو زیادبوون دەڕوات.

بۆیە پشتم بە خوای گەورە بەست و بیرم لە نوسینی کتێبێ کردەوە کە ئەم گرفتە روون بکاتەوە و هۆکار و شوێنەوار و چارەسەرەکانیشی تیا بێ، لەگەڵ هێنانی کۆمەڵێك نمونە لە قورئان و سوننەت و رەوشتی پێغەمبەرﷺ و هێنانی چەند کێشە و گرفتێ لەگەڵ رێگەچارەکانی.

ئەم کتێبە سەرەتایەك و پێنج بەش لەخۆ دەگرێت.

سەرەتاکە دوو بەش لەخۆ دەگرێت:

١. مانای خەسوو.

٢. خێزانی ئارام.

**بەشی یەکەم:**

شێواز و هەڵس و کەوتی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەسو و خەزور (باوك و دایکی هاوسەر).

ئەمیش چەند خاڵی لەخۆ دەگرێ:

١. مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەسوو.

٢. مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەزور.

أـ مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه .

بـ مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عومەری کوڕی خەطاب رضي الله عنه .

جـ مامەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ ئەبی سفیان کوڕی حرب رضي الله عنه .

**بەشی دووەم:**

ڕێڕەوی پێغەمبەر ﷺ لە چۆنێتی مامەڵە لەگەڵ زاوا (مێردی کچ)

ئەمیش چەند خاڵێك لەخۆ دەگرێ:

١ . عثمان کوڕی عەففان هاوسەری روقیە و ئوم کەلثوم رضي الله عنهم .

٢ . ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع هاوسەری زەینەب رضي الله عنهما .

٣ . عەلی کوڕی ئەبو طالب هاوسەری فاطمە رضي الله عنهما .

**بەشی سێیەم:**

کۆمەڵێك چیرۆکێکی واقعی لە ژیانی هاوسەرەکان و خەسوو و خەزور .

ئەمەیش چەند خاڵێك لەخۆ دەگرێت :

١ . خاتو فاطمە ﵂ لەگەڵ خەسویدا ﵂.

٢ . ئومامەی کچی حارث ئامۆژگاریی کچەکەی دەکات .

٣ . خەسویەك لە بەنی تەمیم ئامۆژگاری مێردی کچەکەی دەکات .

٤ . خەسوویەك مێردی کچەکەی ئاسودە دەکات .

٥ . هۆنراوەیەك لە دایکێکی پیرەوە بۆ کوڕە سەرکەشەکەی .

**بەشی چوارەم:**

**گرفتەکانی دوو هاوسەر لەگەڵ خەسوو و خەزوردا (هۆکار و چارەسەر) .**

ئەمیش سێ خاڵ لەخۆ دەگرێت :

١ . هۆکاری گرفت لە نێوان هاوسەر و خەزوران .

٢ . کۆمەڵێ دیاردە و شوێنەواری گرفتی دوو هاوسەر لەگەڵ خەزورانیان .

**بەشی پێنجەم:**

**گرفت و چارەسەر.**

**ئەمە بوو خوای گەورە یارمەتی دام، داواکارم لە خوا ئەم پەڕاوە بکاتە تەرازووی چاکەکانمان لە ڕۆژی قیامەت، مەبەستیشمان چاکە و چاکسازی یە بە ئەندازەی توانامان، پشت و پەناشمان هەر خوایە.**

**سوپاس بۆ خوا لە سەرەتا و کۆتایی و صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەر و ئال و یارانی.**

**نوسەر: د. محمد ابراهیم صقر**

## پێشەکی وەرگێڕ:

بەناوی خوای میهرەبان، درود و سڵاو لە گیانی پێغەمبەر ﷺ و یارانی و شوێنکەوتوانی.

خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگەیە، ئاسودەیی و بەختەوەری کۆمەڵگە بەستراوە بە رێژەی بەختەوەی خێزانەکان، ئەو کێشە و گرفتانەی رووبەڕووی خێزان دەبنەوە وەك کایەیەکی کۆمەڵایەتی، ئاسەوار و جێکەوتەی خراپی لەسەر کۆمەڵگەش دەبێت، بۆیە چەند هەوڵ بدرێت بۆ پاراستنی خێزان و دەستەبەرکردنی ژیانێکی ئاسودە و دوور لە گرفت، هێشتا کەمە، بەتایبەتی لەم رۆژگارەدا کە کیشەکان بەرەو ئاڵۆزی و فرەلایەنی دەڕۆن و لێکترازانێکی کۆمەڵایەتی و کێشە و گرفتی زۆر لەو بوارەدا بەدی دەکرێت.

ئەم کتێبەش باس لە یەکێك لە کێشە کۆمەڵایەتیەکان دەکات کە لەناو خێزاندا، کە پەیوەندی نێوان (بوك و ماڵی خەزورانی) یان (زاوا لەگەڵ ماڵە خەزورانی)، بە شێوازێکی

زانستی و ورد، کێشەکانی دیاری کردووە و ڕێگەچارەی ئایینی و زانستی بۆ دەستنیشان کردووە، ئێمەش بە پێویستمان زانی وەریبگێڕینە سەر زوبانی شیرینی کوردی، تا بتوانین بەشدارێکی ئیجابی بین و خوێنەری کوردیش لێی سودمەند بێت. . .

وەرگێڕ

٢٠٠٩/٥/١١

# دەستپێك

## یەكەم/ واتای خەسوو:

پێش ئەوەی باس لە پەیوەندی نێوان هاوسەرەكان و خەسوو و خەزورانیان بكەین دەبێت لە چەند دێرێكدا مانای (الحماة) رۆشن بكەینەوە.

هەر چەند رەنگە زۆرمان بزانین، بەڵام واتای زمانەوانی بۆ ئەو وشەیە كۆمەڵێ چەمك و واتامان پێ دەبەخشێت كە زۆر كەس لێی بێ ئاگایە.

**الحماة**: تاكە، كۆكەی (أحماء و حموات) بریتیە لە: كەسە نزیكەكانی مێرد هەروەها دایك و باوكی مێردیشە[1].

**وحما**: حَمو المراة و حُموها و حَماها: بریتییە لە باوكی مێردەكەی لەگەڵ برای مێردەكەی وە بە كەسێك دەڵێن كە لە پشتەوە بێ واتە هەر كەس خزمی مێردەكەی بێت.

دایكی مێردەكەی وە هەركەس لە لایەنی مێردەكەیەوە بێت وەك: باوكی و برا و مامی مێردەكەی.

---

[1] بڕوانە معجم لغة الفقهاء دانراوی محمد قلعةجی حامد صادق ج١ – ص٣ – و (لسان العرب) لابن منظور – ج١٢ – ص ١٩٧.

**الأنثى:** تەنها ئەم زمانە هاتووە کە دەڵێ (حمو الرجل) واتە باوکی هاوسەرەکەی یان براکەی یان مامی .

کە دەڵێی : حمو الشيء حميماً و حمي و حماية و محمية .

واتە بەرگری لێکردو پاراستی .

**الحامية:** واتە هاوەڵەکانی لە جەنگدا دەپارێزێ یان کۆمەڵێك خۆیان دەپارێزن .

**الحامية:** ئەو بەردەیە کە بیری پێ هەڵدەچنن .

**الحوامي:** بەو شتە دەڵێن کە لە بەرد دەتپارێزێ .

جا ئەگەر سەیری ئەم واتانە باکەین ئەوەمان بۆ رۆشن دەبێتەوە کە (الحماة) بە کەسێك دەڵێن حیمایە و پارێزگاریت لێ بکات و بتپارێزێ .

واتە : خەسو و خەزور ئەو کەسەیە کە ژن یان مێرد پەنای بۆ دەبەن و سەرچاوەی ئارامیانە ، نەك سەرچاوەی ترس و کێشە و گرفت و ماندوی و ئازار ، کە ئەمڕۆ وا ناسراوە .

## خێزانی ئارام

خێزان کایەیەکی کۆمەڵایەتی یە کە لەسەر پەیوەندی پیاوێك و ئافرەتێك بە پەیوەندیەکی شەرعی ئاشکرا دروست دەبێت، و کۆمەڵێك ئەرك و ماف لەسەر هەر یەکێکیان دروست دمبێت ئەو پەیوەندیەش یاسایەکە هەموو ئاینە ئاسمانیەکان بڕیاریان لەسەر داوە و بە پیرۆز و پڕ خێریان زانیوە و تەنها ڕێگەش بووە بۆ پێکهێنانی هاوسەرداری ڕێگە پێدراو.

ئەمە لەگەڵ یاسای خوا لە هەموو بونەوەردا گونجاوە کە سوننەتی (ازدواج) و دوانییە لە هەموو شتێکدا.

﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ الذاريات: ٤٩.

واتە: لە هەرچی شتدایە نێر و مێمان دروست کردووە تا ئێوەش بیر بکەنەوە.

ئەو جوتی و دوانیە لە بونەوەردا بەوە دەبێت کە شتێك لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا بە یەکتر بگەن وەك بەیەکتر گەیشتنی نێر و مێ، یان سالب و موجەب، سارد و گەرمی کارەبا و تا (گەردیلە) کە بناغەی هەموو بونەوەرە لە ئەلکترۆن و پرۆتۆن و ناوك پێك دێت.

ئەلکتۆرن: هێزێکی کارەبایی سالبە.

پرۆتۆن: هێزێکی کارەبایی بەرامبەر ئەوە و موجەبە.

بۆیە هەرچی پەیامی ئاسمانی هەیە، هاوسەرداری نێوان ژن و پیاویان بە پیرۆز زانیوە، چونکە لەگەڵ سروشتی بونەوەردا دەگونجێت، کەس تەنها نیە جگە لە زاتی خوای گەورە.

﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ﴾ يس: ٣٦.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەرچی (جوت) نێر و مێیە دروستی کردووە، لە روەکدا و لە خۆیان و لە شتانێکیش کە نەیان زانیوە..

بۆیە لە (سفر التكوين) لە تەوراتدا هاتووە (إن الرجل يترك اباه و امه و يلتصق بزوجته، فيصير الاثنان جسداً واحداً) سفر التكوين ١/ ٢٤.

واتە: کاتێ پیاو واز لە باوك و دایکی دەهێنێ و پەیوەندیی دەکات بە هاوسەرەکەیەوە ئیتر هەردووکیان دەبنە یەك لاشە، هەروەها مەسیح پێغەمبەریش (ﷺ) بە قوتابیەکانی وتووە:

انجيل متى ١٩/ ٦ـ٤.

انجيل مرقص ١٠/ ٦ـ٩.

## خێزانی چاك:

ئەو خێزانەیە لەسەر بنەمای هاوسەری ئاسودە دادەمەزرێ کە پێکەوە گونجان و بەزەیی و سۆز لە نێوانیاندایە، ئەم جۆرە خێزانە یەکێکە لە ئامانجە سەرەکییەکانی ژیانێکی ئیسلامی خاوێن، ئەوەش بنەمایەکی سەرەکیە بۆ ئارامی ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵ.

بۆیە ئیسلام سورە لەسەر دروست کردنی ئەم خێزانە، بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێ بنەمای فکری و رەوشتی و یاسایی بۆ داناوە کە خێزانی لەسەر دروست بکرێ و بەردەوام بێت، هەروەها لە هۆکارەکانی جیابونەوە و داروخان پاراستویەتی.

یەکەم خاڵ کە ئیسلام لەو بوارەدا ئەنجامی داوە ئەوەیە، کە مرۆڤی موسڵمان ژیانی خێزانداری کە ئیسلام دایناوە بزانێ، وە مەبەستەکانی لا ئاشکرا بێت بۆ ئەوەی بەبەرچاو رۆشنی کارەکانی ئەنجام بدات.

چونکە ئەگەر بە دیدێکی شێواو دەست پێ بکات هەڵسوکەوت و مامەڵەیەکی شێواو بەرهەم دەهێنێ.

ئەو موسڵمانەی دەیەوێت خێزان دروست بکات پێویستە بزانێت تەنها بەیەك گەشتنی دوو جەستە نییە بە یەکتر، بەڵکو پەیوەندی مرۆڤێکە بە مرۆڤێکی ترەوە.

مرۆڤیش لە ژیری و ویژدان و رۆح و سۆز پێك هاتووە پێش ئەوەی لە لاشەیەکی مادی پێك هاتبیّ.

ئەمەش مانای وا نییە کە لەزەتی جەستەیی و تێرکردنی حەزەکان لەم چوار چێوەدا بونیان نییە بەڵکو ئەویش یەکێکە لە ئامانجەکان بۆ هەردوو هاوسەر ئەمەش لەگەڵ سروشتی مرۆڤەکان دەگونجێت و پێکەوە چێژ لە حەلاڵ و پاکەکان وەردەگرن دەبنە کالاّ بۆ یەکتر، وەك خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ البقرة: ١٨٧.

وە بۆ ئەوەیە مرۆڤی موسڵمان ئارەزووەکانی خۆی لە چوارچێوەی حەلاڵدا بەکاربهێنیّ و خۆی لە شتە قەدەغە کراوەکان بپارێزیّ؛ بەمەش حەزەکان سنوریان بۆ دیاری دەکرێت، ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلامﷺ روو دەکاتە گەنجانی موسڵمان و دەفەرمویّ:

**(يا معشر الشباب من استطاع الباءة فليتزوج فإنه اغض للبصر و احصنُ للفرج، و من لم يستطيع فعليه بالصوم، فإنه له وجاء)** صحيح البخاري٥٠٦٦ ، صحيح مسلم ١٤٠٠ .

واته: ئەی کۆمەڵی لاوان هەر کەس توانای هەڵسورانی کاروباری خێزانداری هەیە با ژن بهێنێ، چونکە ئەوە باشتر چاو و دامێن دەپارێزێ، هەرکەس نەیتوانی با بەڕۆژوو بێت، ئەوە بۆی چارەسەرە.

بەڵکو موسڵمان و باوەڕدار کاتێ خێزان پێك دەهێنێ مەبەستی هەر ئەوە نییە، بەڵکو ئامانجی دروستکردنی ماڵێکی موسڵمان و خێزانێکی چاکە، تا لەگەڵ هاو وێنەکانی تر ببنە، بنەمایەك بۆ کۆمەڵگایەکی تەندروست، ئەو خێزانەش لەسەر سێ بناغە دروست دەبێت.

١ . ئارامی .

٢ . سۆز .

٣ . بەزەیی .

ئەمەش قورئان بە یەکێك لە ئایەت و بەڵگەکانی خوای گەورەی داناوە، هەر ئەو سێ خاڵەش دەبێتە سێبەر بۆ خێزانێکی باوەڕدار.

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم: ٢١.

خێزان لە ئیسلامدا تەنها بریتی نییە لە پەیوەندیەکی نێوان ژن و مێرد، بەڵکو پەیوەندی نێوان دوو خێزانە کە دەبنە پشتی یەك، ئەو پەیوەندییە قورئان لە پاڵ پەیوەندی خوێندا دایناوە[1].

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾ الفرقان: ٥٤.

---

[1] الاسرة كما يريدها الاسلام – د. يوسف القرضاوي – ص٩.

## بەشی یەکەم

مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەسوو و خەزوردا (دایك و باوکی هاوسەر).

**یەکەم/** مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەسوو

**دووەم/** مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەزور

١ـ مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەبو بەکری صدیقرضي الله عنه.

٢ـ مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ عومەری کوڕی خەطابرضي الله عنه.

٣ـ مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەبی سفیان کوڕی حربرضي الله عنه.

بێگومان پەیوەندی نێوان پیاو لەگەڵ خەزورانیدا بە تایبەت (خەسوو) بۆتە ماددەیەکی بنەڕەتی بۆ زۆرێك لە چیرۆك و نوکتە و زنجیرە دراماکان و فیلم و شانۆگەرییەکان.

ئەو پەیوەندییە لەلای ئەو جۆرە مرۆڤانە لە بازنەی کینە و رق لێ بون و ململانێ و چاڵ بۆ یەکتر هەڵکەندن تێناپەڕێت و هەمیشە ئەم بوارە نیشان دەدەن و لەبیر و ئەندێشەی بینەراندا ئەوە دەکەنە یاسا وچەسپاو کە هەمیشە لە نێوان ئەواندا کێشە و گرفت و ناکۆکی هەیە، جگە لەو شێوازە بونی زۆر کەمە.

بۆیە کاتیٚ دەبنین کەسێك ڕێز لە خەسوی دەگرێت و پەیوەندیەکی ئاسایی لەسەر بنەمای ڕێز و حورمەت لەگەڵ کەس و کاری هاوسەرەکەیدا دروست دەکات، لای ئەو جۆرە کەسانە دەبێتە جێگەی گاڵتەجاڕی، یان لانی کەم سەرسامی خۆیان لەو شێوازە مامەڵەیە دەردەبڕن، بۆیە زۆر پێویستە ئەو بیروبۆچونە ڕاست بکرێتەوە.

بۆ ئەمەش زۆر پێویستمان بە ژیانی پێغەمبەری مامۆستامان ﷺ هەیە، ئەو پێغەمبەرەی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ڕابەر و پێشەواو چاوساغمانە، تا بزانین چۆن مامەڵەی لەگەڵ خەسوو و خەزوریدا کردووە، ئێمەش شوێنەواری هەڵبگرین و چاوی لێبکەین و لەسەر بەرنامەکەی ڕێگە ببڕین.

## یەکەم/ مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەسویدا.

لەگەڵ ئەوەی دەقمان کەمە کە باس لەو پەیوەندییە بکات کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەسویدا ئەنجامی داوە، بەڵام ئەو کەمەش مەشخەڵی ئەو مامەڵەیەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە چۆن پێغەمبەری خواﷺ رێز و حورمەتی بەرامبەریان بووە.

ئەوەتا (أم رومان) رەزای خوای لەسەر کە دەکاتە هاوسەری (ئەبوبەکری صدیق) و دایکی عائیشە (رەزای خوایان لێ بێت) و خەسووی پێغەمبەری خواﷺ لەلایەن هاوسەری کچەکەیەوە کە پێغەمبەرە جوانترین رێزی لێدەگرێت.

لە کاتێکدا بەرامبەری دەفەرموێ (مَن سرّهُ ان ینظر الی إمرأة من الحور العین فلینظر الی أم رومان)[1]

واتە: هەرکەس حەز دەکات سەیری ئافرەتێك بکات لە حورییەکانی بەهەشت، با سەیری (ام رومان) بکات.

---

[1] کنز العمال للملتقی الهندی -ج١٢-ص١٤٦ و ابن حجر لە (الاصابة)دا باسی کردووە ٤/٤٥١.

وە کاتێك ئەو ئافرەتە بەڕێزە دەمرێت، پێغەمبەری خواﷺ زۆر دڵگران دەبێت و زیاتر بەڕێز و بەخشندە دەبێت لەگەڵیدا، لەو کاتەدا کە بە دەستە پیرۆزەکانی دایدەگرێتە ناو گۆڕەکەوە پاشان دوعا دەکات و دەفەرموێت: **(اللّهُمَّ إنك تعلم ما لاقت أم رومان في سبيلك)** الاصابة لابن حجر ٤/٤٥١.

واتە: پەروەردگار خۆت ئاگاداری کە (ام رومان) لە پێناو پەیام و بەرنامەکەی تۆدا چەند ئازاری چەشتووە.

ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ جوانترین نمونەمان پێشکەش دەکات لە مامەڵە لەگەڵ خەسودا کە بنەمای ڕێز و ئەدەب و گەورەیی نواندن دروست دەبێ، پڕ لە سۆز و وەفاداری بە شێوەیەك کە پێغەمبەری خواﷺ بە دەستی خۆی ئەسپەردەی خاکی دەکات.

خۆزگە هاوسەرەکان بە وردی ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەری خوایان ﷺ وەردەگرت و چاویان لێدەکرد، نەك شوێن درۆ و شتی بێ مانا و هەڵبەستراو بکەون کە بە ناوی هونەرەوە برەوی پێ دەدرێت.

## دووەم/ مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەزوردا.

گەورەمان ئەبو بەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنهما) دوو گەورە هاوەڵی بەڕێز و پایەبەرزی پێغەمبەر ﷺ بوون ئەوان وەك وەزیر و راوێژکاری بون، لە هەمان کاتدا خەزوری بوون، باوکی دوو ئافرەت بوون کە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ و دایکی باوەڕداران و خاوەنی پلە و رێزێکی گەورە بوون لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش (عائیشە و حەفصە)بوون (رضي الله عنهما)، بەڕاستی گەورە و بچوکی موسڵمانان دەزانن ئەم دوو هاوەڵە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بەڕێز بوون، پەڕاوەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و مێژووی ئیسلام پڕن لە روداو و بەسەرهات لە فەزڵ و گەورەیی و پلەی ئەو دوو هاوەڵە لە دڵی پێغەمبەردا ﷺ، ئاشکرایە چەند خۆشەویست بوون لە لای، ئەوەی لێرەدا مەبەستی ئێمەیە پەیوەندی ئەو دوو هاوەڵە بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە ئاستی خێزانی و کۆمەلایەتی.

## ١. مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر (رضي الله عنه)

بە دڵنیاییەوە ئەبو بەکری صدیق و ماڵ و خێزانی (رضي الله عنهم)، لە ماوەی مانگێك کە روداوی (ئیفك) دروست کرا زۆر ماندوبون، ئەوەش فەلسەفەیەکی پەروەردەیی بوو کە وەحی دواکەوت و ماوەی مانگێك بەو ئازارەوە مانەوە و پاشان ئایەتی قورئان هات و پاکی عائیشەی راگەیاند.

با گوێ لە عائیشەی دایکی باوەڕداران بگرین (رضي الله عنها)، تا بەشێك لەو نارەحەتیانەمان بۆ بگێڕێتەوە:

بەڕاستی ئەو ماوەیە چاوەکان لە فرمێسك وشك نەبونەوە، خەو لە چاوەکانم تۆرابوو بە شێوەیەك باوك و دایکم هەستیان دەکرد وا گریان خەریکە دڵ و جگەرم پارچە پارچە دەکات.

دەڵێ: رۆژێك باوك و دایکم لام دانیشتبوون و منیش دەگریام، لەو کاتەدا ئافرەتێکی ئەنصاری مۆڵەتی وەرگرت و هاتە ژورەوە و ئەویش لام دانیشت و کەوتە گریان پاش کەمێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، سڵاوی کرد و پاشان دانیشت.

دەڵێ: لەو کاتەوە کە ئەو تۆمەتانەم بۆ هەڵبەسترا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتبو بۆ لام، ماوەی مانگێك تێپەڕی و هیچ ئایەتێك لە بارەی منەوە نەهاتبوو.

دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت شایەتی داو فەرمووی: لە دوای ئەوە ئەی عائیشە، من شتێکم دەربارەی تۆ بیستووە، ئەگەر پاك بیت، خوای گەورە پشتت دەگرێ و رایدەگەیەنێ، ئەگەر توشی هەڵیەکیش بویت، داوای لێخۆش بوون لە خوا بکە و پەشیمان بەرەوە چونکە هەر کات بەندە دانی بە گوناهەکەیدا نا خواش لێی خۆش دەبێت.

دەڵێ: لەم کاتەدا من هەستم کرد فرمێسکم وەستا و نەمتوانی بگریم.

بە باوکم وت: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە. وتی: سوێند بە خوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێم!.

لە جێگەیەکی تردا دەڵێ: ماوەیەکی زۆر تێپەڕیوو من ئاگاداری ئەو هەواڵ و پڕوپاگەندە نەبووم کە لە مەدینە بڵاو بۆتەوە، وە پێغەمبەریش ﷺ گاڵتە و یاری کە پێشتر لەگەڵمی

دەکرد وازی لیٚ هیٚنابوو، پاش گەشتنی هەواڵەکە مۆڵەتم وەرگرت کە بچمەوە ماڵی باوکم.

کە دەچیٚتەوە دایکی دەبینیٚ هەروەها باوکیشی لەسەربان خەریکی قورئان خویٚندنە، ئەویش (عائشە) پرسیار لە دایکی دەکات دەربارەی ئەو قسە و قسەڵۆکە کە ئایا باوکم بیستویەتی، دایکی دەڵیٚ: بەڵیٚ، دەڵیٚ: ئەی پیٚغەمبەری خواﷺ دایکی دەڵیٚ: بەڵیٚ.

ئیتر دەست بە گریان دەکات تا باوکی گویٚی لە دەنگی دەبیٚت، لەسەربان دادەبەزیٚ و بە دایکی دەڵیٚ ئەوە چییەتی؟ دایکی دەڵیٚ: ئەویش هەواڵەکەی بیستووە دەربارەی.

باوکی چاوی پڕ دەبیٚت لە فرمیٚسك و دەڵیٚ کچم سویٚندت دەدەم کە بگەڕیٚیتەوە بۆ ماڵی خۆت.

منیش گەڕامەوە و دایك و باوکم لەگەڵم هاتن تا کاتیٚك پیٚغەمبەری خواﷺ لە دوای نویٚژی عەسر گەڕایەوە، بینی وا باوکم و دایکم لەملاولام دانیشتوون.

پیٚغەمبەری خواﷺ شایەتی داو و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو شیٚوەی شایستە بیٚت پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە ئەگەر

توشی هەڵەیەك بویت، یان ستەمت لە خۆت کردووە، تەوبە بکە وپاشگەز بەرەوە، خوای گەورە تەوبەی تەوبەکاران وەردەگرێ، لەو کاتەدا ئافرەتێکی ئەنصاریی لە لای دەرگاکە دانیشتبوو، وتم: شەرم ناکەن لەو ئافرەتە شتێ بڵێ.. بە باوکم وت: وەڵامی بدەرەوە، وتی بلێم چی؟!، بە دایکم وت: وەڵامی بدەرەوە، وتی: بڵێم چی؟! کەسیان وەڵامیان نەدایەوە.

ئینجا من شایەتیم داو سوپاسی خوای گەورەم کرد پاشان وتم: سوێند بە خوا ئەگەر بڵێم من کاری وام نەکردووە، خوا شایەتە کە راست دەکەم، ئەوە لای ئێوە هیچ سودی نییە، قسەکەتان بیستووە و دڵتان وەری گرتووە، ئەگەر بڵێم ئەوەم کردووە خوای گەورە دەزانێ کە من کاری وام نەکردووە و دەڵێن بۆ وای لە خۆی کرد.

سوێند بە خوا نمونەی من و ئێوە تەنها وەك باوکی یوسفە (ناوەکەیم لەبیر نییە) کە فەرمووی: **(فصبر جميل والله المستعان على ما تصفون)**.

هەر لەو کاتەدا ئایەتێك هات بۆ پێغەمبەر ﷺ و هەستم کرد پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی گەشایەوە و عارەقی لە نێو چاو دەسڕی و دەیفەرموو: مژدە بێت ئەی عائیشە، خوای گەورە ئایەتی پاکی و پاکیزەیی تۆی نارد.

منیش لەو کاتەدا زۆر لە جاران تورەتر بووم باوکم و دایکم وتیان: هەستە بچۆرەلای و سوپاسی بکە وتم: سوێند بە خوا ناچم بۆ لای و سوپاسی ناکەم و سوپاسی ئێوەش ناکەم، چونکە ئەو قسە و پروپاگەندەتان بیست و نکوڵیتان لێنەکرد.

بەڵکو سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە پاکی منی ڕاگەیاند و ئایەتی ناردە خوارەوە و بەرگری لێکردم، پێغەمبەریش ﷺ هات بۆ ماڵم و پرسیاری دەربارەی من لە کەنیزەکەکە کرد.

ئەویش وتی: سوێند بە خوا هیچ کەم و کوڕی تێدا نابینم.

پاشان ئەو پاگەندەیە گەیشتەوە بەو پیاوەی قسەکەی بۆ هەڵبەستراوە وتی: پاك و بێگەردی بۆ خوا، سوێند بە خوا پەرچەمی هیچ ئافرەتێکم لانەداوە، ئەویش لە پێناوی خوادا شەهید بوو، عائیشە دەڵێت: زەینەبی کچی جەحش خوای گەورە

پاراستی و جگە لە قسەی چاك هیچی نەوت، بەڵام خوشكەكەی (حَمنة) كەوتە ناو ئەو كۆمەڵەی كە تیا چوون و قسەیان دەربارەی ئەو رو‌داوە بە خراپی كرد لەوانەش گەورەی دووڕووەكان (عبدالله كوڕی ئوبەی) كە بڵاوەی بە دەنگ و باسەكە دەكرد، هەروەها (مسطح و حسان كوڕی ثابت)یش، بۆیە ئەبو بەكر سوێندی خوارد كە چیتر (مسطح) سوودی لێنەبینێ و هیچی پێ نەبەخشێت.

خوای گەورەش ئایەتی ناردە خوارەوە و فەرموویێت:

﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ﴾ النور: ٢٢.

واتە: ئەوانەی بەخشندە و خواپێداون (واتە: ئەبوبەكر) با بڕیار نەدەن كە یارمەتی لە هەژاران (مسطح) بكرنەوە ﴿أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ﴾ ئایا پێتان خۆش نییە خوا لێتان خۆش بێت، ﴿أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەبو بەكر وتی: بەڵێ سوێند بە خوا ئێمە پێمان خۆشە كە لێمان خۆش بێت، ئیتر یارمەتیەكەی بۆ گەڕاندەوە كە پێشتر بۆی بڕیار دابوو[1].

---

[1] بڕوانە (صحیح المسلم) بەشی (التوبة) ٢٧٧٠.

خوای گەورە لە ئەبوبەکر رازی بێت، پیاوێکی ئارامگر و رازی بە بڕیاری خوا، دڵنیا لە پاکی کچەکەی چاوەڕێی دەروازەی رەحمەتی خوا دەکات تا غەم و پەژارەکەی لەسەر لابات، لەو ساتە پڕ لە تاقیکردنەوەدا چاوەڕێی پاداشتی خوای گەورە دەکات و لێبوردن دەکاتە دیاری بۆ ئەوانەی بەشداری بوهتانەکە بوون بەڕاستی شایستەی ئەوەیە کچەکەی بچێتە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ، ئەمەش وانەیەکی کرداری بەرزە بۆ کۆمەڵگای موسڵمان لە هەموو کات و شوێنێکدا کە چۆن بەربەرەکانی بوهتان و پروپاگەندەی ناحەزانی ئیسلام بکەن.

ئەمە پەیوەندی ئەبوبکر بوو ﷺ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەرووی خێزانییەوە.

## ٢. مامەڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عومەر رضي الله عنه

عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه کە باوکی یەکێکی ترە لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر و دایکی باوەڕداران کە (حفصە)یە (رضي الله عنها).

زۆر بە ئاشکرا ڕێزگرتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ عومەر دیارە.

لەو کاتەدا کە (حفصە) هەواڵ دەدات بە باوکی کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمڕۆ پێغەمبەریان ﷺ تورە کردووە، ئیمامی عومەر دەڵێ: سوێند بە خوا دەزانم پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی ناوێت، ئەگەر لەبەر من نەبێت لێت جیا دەبێتەوە.

بەڕاستی ئەم پێشبینیە رویدا کاتێ پێغەمبەر ﷺ حەفصەی تەڵاقدا و ئیمامی عومەر زۆر ترسا و وتی: ئەگەر خوای گەورە پێویستی بە ماڵ و خێزانی عومەر بوایە، پێغەمبەری خوا ﷺ (حفصە)ی تەڵاق نەئەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نوێژ و بیلال بانگیدا و پاشان قامەتی نوێژی کرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ رووی لە قیبلە کرد گەڕایەوە تا چووە ژوورەکەی (حەفصە) فەمووی: جبریل لە قیبلەوە هات بۆ لام و فەرمووی: بڕۆ حەفصە

بکێڕەوە، چونکە ئەو ئافرەتێکە زۆر بەرۆژو دەبێت و شەونوێژی زۆرە و ئەویش لە بەهەشتدا هاوسەرتە. .

لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ئەمەش میهرەبانی خوایە بەرامبەر بە عومەر. . . الطبراني.

ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەری خواﷺ هەرگیز عومەر لە یادی نەکرد کە بەو شێوە ناوازەیە مامەڵەی لەگەڵ کرد، وە زۆریش دەترسا جارێکی تر دوبارە بێتەوە و کارەساتەکە گەورەتر بێت بۆیە رۆژێك چوو بۆ لای (حفصە) بینی وا دەگری!! زۆر ترسا لەوەی کە جارێکی تر پێغەمبەری ﷺ تورە کردبێت و ئەویش تەڵاقی دابێت، وتی: ئەڵێی پێغەمبەری خواﷺ جارێکی تر تەڵاقی داویت، ئەگەر وا بێت هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم، (بەڵام سوپاس بۆ خوا وانەبوو).

## ٣. مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو سفیان رضي الله عنه

سەیری هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ بکەین لەگەڵ یەکێکی تر لە خەزورانی کە (ئەبو سوفیان)ـە، یەکێکە لە گەورەکانی قورەیش و پیاوماقوڵانیان باوکی (ام حبیبە)ی خێزانی پێغەمبەرﷺ و دایکی باوەڕدارانە.

دەبینین ئەوەی لە ساڵی (الفتح)دا رویدا رێزگرتن و پلە بۆ دانانی باوکی هاوسەرەکەی بوو، لە هەمان کاتدا خوێندنەوەی ئیعتباراتی شەرعی و رامیاری و کەسایەتی بوو کە پێغەمبەری خواﷺ وەڵامی داخوازییەکەی عەباسی مامی دایەوە کە فەرمووی: ئەبو سوفیان پیاوێکی ناودارە حەزی بەو شتانە هەیە، تۆش پلە و رێزێکی پێ ببەخشە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبو سفیان پارێزراوە، هەرکەس دەرگای ماڵەکەی داخات پارێزراوە، هەرکەس بچێتە مزگەوتی کەعبەوە پارێزراوە[1].

---

[1] بڕوانە (صحیح السیرة النبویة) ابراهیم العلی – ص ٥١٩.

ئەوەی گومانی بۆ دەبرێ ئەبو سوفیان کە خەزوری پێغەمبەرە ﷺ، حسابی بۆ کراوە بە شێوەیەك لە شێوەکان چونکە هەر خودی ئەبو سوفیان شانازی بەم خزمایەتیەوە دەکرد پێش موسڵمان بونیشی لە کاتێکدا کە دوژمنی ئیسلامیش و پێغەمبەریش ﷺ بوو.



# بەشی دووەم :

شێوازی پێغەمبەرﷺ لە مامەڵەی لەگەڵ مێردی کچەکانی (زاواکانی)دا .

**یەکەم/** عثمان کوڕی عەففان هاوسەری روقیە و ئوم کەلثوم(رضي الله عنهما) .

**دووەم/** ئەبولعاصی کوڕی رەبیع هاوسەری زەینەب(رضي الله عنها) .

**سێیەم/** عەلی کوڕی ئەبو طالب هاوسەری فاطمە(رضي الله عنها) .

## بەشی دووەم :

### مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ مێردی کچەکانی

ئەمڕۆ موسڵمانان زۆر پێویستیان بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیان هەیە لەم بوارەدا کە بریتیە لە پەیوەندی خەزور لەگەڵ زاواکانی لە کۆمەڵگادا کە هەموو بوارەکانی ژیان پێویستیان بەچاکسازی و سەرلەنوێ دارشتنەوەی پەیوەندیەکان هەیە.

ئەمەش هەندێ هەڵوێستی بەرز و دیمەنی گەورەیە لە ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ کە نیشانەی نواندنی رێز و بەخشندەییە بەرامبەر زاواکانی.

**یەکەم/ لەگەڵ خاوەنی دوو نوور (عثمان کوڕی عەفانرضي الله عنه)**

ئەوەتا (عثمان) ئەم ناوەی بەسەردا بڕواه لەبەر ئەوەی دوو کچی پێغەمبەری ﷺ خواستووە، یەکەمیان خاتوو روقیە بوو، کاتێك وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ خاتوو (أم کلثوم)ی خوشکی (روقیە)ی پێ بەخشی، کاتێك ئەویش وەفاتی کرد پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەگەر کچێکی ترم هەبوایە، ئەویشم دەکردە هاوسەرت ئەی عثمان رضي الله عنه!!

ئەمەش بەڵگەی خۆشەویستی و مامەڵەی جوان و ڕێزی پێغەمبەر ﷺ و ڕەوشت بەرزییەتی لەگەڵ پێشەوا عثماندا.

لەو بارەوە لە زۆر فەرموودە و شوێن و کاتدا پێغەمبەر ﷺ ستایشی عثمانی کردووە، ئەو یەکێکە لە دە کەس کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە وە سێهەم جێنشینی پێغەمبەری خوایەﷺ، ژیان و تێکۆشان و بەخشندەیی لە ڕێگەی خودا لەلای کەس شاراوە نیە.

## با چەند نمونەیەك لە ڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم هاوەڵە بهێنینەوە:

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خاتوو عائیشە ڕاکشابوو هەندێ لە قاچ و ڕانی بەدەرەوە بوو، ئەبوبەکر رضي الله عنه مۆڵەتی خواست و هاتە ژوورەوە و پێغەمبەر ﷺ نەجولا، ئەبو بەکر رضي الله عنه پێویستی خۆی تەواو کرد و ڕۆیشت، پاشان عومەر رضي الله عنه هات و مۆڵەتی خواست، پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەر حاڵی خۆی بوو، نەجولا، ئەویش کاری خۆی تەواو کرد و ڕۆیشت، پاشان عثمان رضي الله عنه مۆڵەتی خواست، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی کۆکردەوە و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی دا، کاتێ ڕۆیشت، خاتو عائیشە رضي الله عنها پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ بۆچی کە عثمان رضي الله عنه هات خۆت کۆکردەوە و بەرگەکەت پۆشی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا لە کەسێك شەرم نەکەم کە فریشتەکانی خوا شەرمی لێ دەکەن!؟

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێ:

عثمان پیاوێکی شەرمنە، ترسام ئەگەر بەو شێوە بێتە ژوورەوە، شەرم بکات و ڕوی نەیەت داواکارییەکەی بڵێت. [1]

[1] بڕوانە (صحيح المسلم) ٢٤٠١.

## دووەم/ لەگەڵ (ئەبی لعاصی کوڕی ڕەبیع رضي الله عنه )

کاتێ سەرانی قورەیش زۆریان لە (أبو لعاص) کرد بۆ ئەوەی کچەکەی پێغەمبەر (زەینەب) تەڵاق بدات، ئەو زۆر مەردانە بەرپەرچیان بۆوە و داواکەی جێبەجێ نەکردن، لە کاتێکدا کوڕەکانی (ئەبو لەهەب) هەردوو کچەکەی پێغەمبەریانﷺ تەڵاقدا، چەند جار چونە لای و پێیان وت: ئەو هاوسەرەت تەڵاق بدە، هەر ئافرەتێکت دەوێت پێت دەبەخشین، بەڵام ئەو هەڵوێستی بەرزی نواند و داواکاری سەرانی قورەیشی جێبەجێ نەکرد و پێی وتن: هەرگیز لە هاوسەری خۆم جیا نابمەوە و پێم خۆش نییە، هاوسەری خۆم بگۆڕمەوە بە ئافرەتێکی تر لە قورەیش..

پێغەمبەری خواش ﷺ ئەم هەڵوێستەی لە بیر ناچێت و ڕۆژان تێپەڕ دەبن و لە غەزای بەدردا (ئەبولعاص) بە دیلی کەوتە دەست موسڵمانان، لەو کاتەدا هاوسەرەکەی ماڵ و سامان دەنێرێ بۆ ئازادکردنی، لەناویدا کلاوێك هەیە کە پێشتر خاتوو خەدیجەی دایکی پێی بەخشیبوو لە کاتی شوکردنیدا.

کاتیٚ پیٚغەمبەری خوا ﷺ دەیبینیٚ، دڵی نەرم دەبیٚت و یادی هاوسەری بەوەفا و ریٚزداری دەکەویٚتەوە، هەروەها وەفاداری کچەکەی بۆ هاوسەرەکەی دەبینیٚ، لەو کاتەدا پیٚغەمبەری خوا ﷺ وەك سەرکردەی یەکەم، دەیتوانی بڕیاری ئازادکردنی دەربکا و (ئەبولعاص) ئازاد بکات.

لەگەڵ یادکەوتنەوەی هاوسەری بەوەفا و لەگەڵ خۆشەویستی بۆ کچە بەریٚزەکەی و لەگەڵ ریٚزی بۆ هاوسەری کچەکەی کە پیٚشتر هەڵویٚستی مەردانەی نواندبوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پیٚغەمبەری خوا ﷺ یەکلایەنە، بڕیاری لیٚبوردنی دەرناکات و بەبیٚ (فیدیة) (ئەبولعاص) ئازاد ناکات کە پیٚشتر لەگەڵ هەندیٚ لە دیلەکان کردبووی، بەڵکو ئەم بڕیارە دەخاتە بەردەست هاوەڵان و دەفەرمویٚ (ئەگەر بە باشی دەزانن کە ئەسیرەکە بگیٚڕنەوە بۆ لای و فیدیەکەشی بۆ بگیٚڕنەوە، ئەنجامی بدەن).

ئەوانیش بە کۆی دەنگ بڕیاری ئازادکردنی (ئەبولعاص) دەدەن بەبیٚ بەرامبەر.

پێغەمبەریش ﷺ پەیمانی لێوەردەگرێ کە مۆڵەتی (خاتو زەینەب) بدات تا کۆچ بکات بۆ مەدینە، ئەویش خاوەنی بەڵێنی خۆی دەبێت و پەیمانەکەی دەباتە سەر .

ڕۆژان تێپەڕ دەبن، جارێکی تر (ئەبولعاص) بە دیلی دەکەوێتە دەستی کۆمەڵێ موسڵمان لە کاتێکدا هەندێ شتومەك و سامانی بازرگانی لە شامەوە دەهێنێتەوە، هەرچۆنێك بێت خۆی لە دەستیان ڕزگار دەکات و لە شوێنێ خۆی حەشار دەدات تا شەو دادێت .

بە نهێنی دەچێتە شاری مەدینە و دەچێتە ماڵی (هاوسەرەکەی) داوای پەنای لێدەکات ئەویش پەنای دەدات .

کاتێ نوێژی بەیانی بانگ دەدرێ، زەینەب لە جێگەی تایبەتی ئافرەتەکانەوە لە مزگەوت دەڵێت: خەڵکینە ئاگاداربن من پەنای (ئەبو لعاصی کوڕی ڕەبیع)م داوە پێغەمبەرﷺ سەرسام دەبێت بەم قسانە لە دوای تەواوبوونی نوێژ ڕوو دەکاتە خەڵکەکە و دەفەرموێت:

ئەی خەڵکینە: ئەوە گوێتان لێ بوو زەینەب چی وت؟

وتیان: بەڵێ، فەرموی: دەی سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، من ئاگاداری هیچ شتێ نەبووم، تا کاتێ ئەو قسانە کراوە، دەشزانن کە موسڵمان دەتوانێ پەنای خەڵك بدات، ئینجا پێغەمبەرﷺ بەرەوماڵی زەینەب ڕۆشت.

بێگومان لە ڕێگادا چەند خەیاڵی جۆراوجۆری کردبوو دەربارەی کچە موسڵمانەکەی کە چەند هاوسەر خۆی خۆشدەوێت لە کاتێکدا هاوسەرەکەی (موشریکە) و ئیسلامیش جیای کردونەتەوە بەڵام هیچ کێشەیەك نابینێ کە پەنای بدات، لە کاتێکدا ئەو (ئەبولعاص) مافی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەیە کە لە سریەکەدا بوون و بەدیل گرتبویان.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خواﷺ دەچێتە لای کچەکەی و حوکم و بڕیاری خۆی پێ ڕادەگەیەنێت و دەڵێ: کچم ڕێزی بگرە، بەڵام وریابە، تازە تۆ هاوسەری ئەو نیت و بۆ یەکتر حەڵاڵ نین.

ئینجا دەنێرێ بەشوێن سریەکەدا کە ماڵەکەی (ئەبولعاص)یان گرتووە بە بێ ئەوەی فەرمانیان پێ بکات کۆمەڵێ پێشنیار دەخاتە بەر چاویان و دەفەرموێت:

ئەو پیاوە ئێستا لەی ئێمەیە چونکە دەزانن کە پەنادراوە، ئێوەش سامان و ماڵەکەیتان گرتووە، ئەگەر چاکە بکەن و بۆی بگێڕنەوە، ئێمە پێمان خۆشە، ئەگەر ناشتانەوێت بیگێڕنەوە ئەوە زۆرتان لەسەر نییە و مافی خۆتانە و خوا پێی بەخشیون.

ئەم شێوازە جوانە کاریگەری دەبێت و هەموو پیاوانی سریەکە بە رەزامەندی دڵی خۆیان ماڵەکەی بۆ دەگێڕنەوە.

(ئەبولعاص) لەم هەڵوێستەی پێغەمبەرەوە ﷺ دڵنیا دەبێت کە ئیسلام پەیامێکی راستە و پڕە لە رەوشتی بەرز و جوان، وە محمدیش راست دەکات لەو شتەی بانگی بۆ دەکات.

بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ لای گەلەکەی و سامان و ماڵەکەیان دەداتەوە و موسڵما بوونی خۆی رادەگەیەنێت و دەگەڕێتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە[1].

برای بەڕێز سەیری ئەم هەڵوێستە جوان و ناوازەیە بکە کە چەندین پەند و ئامۆژگاری تێدایە، بزانە مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ مێردی کچەکەی چۆن بووە لە کاتێکدا هێشتا بێباوەڕەو

[1] تاريخ الطبري – البداية و النهاية ٣/٢١٣.

موسڵمان نەبووە، ئەو هەڵوێستە کاریگەری دەبێت و ڕێگەی ڕاستی و هیدایەت نیشانی ئەو کەسە دەدات و موسڵمان بونی خۆی ڕادەگەیەنێت.

خوای گەورە لە (ئەبولعاص) خۆش بێت. بەرەکەت و پیرۆزی بخاتە خانەوادەکەی و خەزوری پڕ سۆز و میهرەبانی کە محمدی گەورەی پێغەمبەرانە سەلامی خوای لیّ بێت.

خۆزگە شوێنکەوتوانیشی چاویان لیّ دەکرد و ڕێگەی ئەویان دەگرت، تا لە دنیا و دوارۆژدا سەرفراز و بەختەوەر بن.



**سێیەم/ مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طالب، (رضي الله عنه).**

با پێکەوە ئەم دیمەنە لە مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ گرفتێکی نێوان خۆشەویسترین کچی (فاطمە رضي الله عنها) لەگەڵ مێردەکەیدا (عەلی کوڕی ابو طالب رضي الله عنه) ببینین، بزانە پێغەمبەر ﷺ دەبێتە نمونەی جوان بۆ خەڵك تامالەکان پڕ بن لە بەختەوەری، سۆز و میهرەبانی و لێبوردن جێگەی رق و کینە و دوبەرەکی بگرێتەوە.

ئیمامی موسلم لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ ماڵی فاطمە بەڵام عەلی لەماڵ نەبوو، فەرمووی: ئامۆزاکەت لەکوێیە؟ وتی: لە نێوانماندا شتێك رویدا و تورە بووم، رۆشتە دەرەوە و لە ماڵ ئیسراحەتی نیوەڕۆی نەکرد، پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: بزانە لە کوێیە؟ رۆشت و گەڕایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت راکشاوە. پێغەمبەری خواﷺ هات بینی وا راکشاوە و عەباکەی کەوتبووە خوار و خۆڵاوی ببوو، پێغەمبەریشﷺ تەکاندی و فەرمووی: هەستە (باوکی خۆڵ و خاك)، (هەستە باوکی خۆڵ و خاك).

جا سەیری ئادابی گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە کە فێری فاطمەی کردبوو، ئەوەتا پرسیاری مێردەکەی لێکرد، تەنها ئەوەندەی وت: کە شتێك لە نێوانیاندا رویداوە و تورە بووە و لەماڵ دەرچووە، نەك وەك هەندێك لە کچانی ئەمڕۆ ئەگەر یەکێکیان کێشەیەکیان هەبێت و باوك یان دایکیان ببینن، خێرا دەست دەکەن بە گێڕانەوەی ئەو شتانەی لە نێوان خۆیان و مێردەکانیان رویداوە و زۆر جاریش هەندێك لەو قسانە راست نیە و زۆرێکیش زیادەڕەوی و شتی بچوکە کە شایستەی باسکردن نییە.

بەڵکو هەندێ لە ریوایەتەکان وا باس دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ لە دەم و چاوی کچەکەیدا شتێکی خوێندۆتەوە کاتێ پرسیاری لێ کردوو، فاطمە وتویەتی: من نهێنی مێردەکەم ئاشکرا ناکەم، با بۆ باوکیشم بێت... چەند گەورە و ناسکە ئەم هەڵوێستە!!

ئینجا سەیری هەواڵ پرسینی پێغەمبەر ﷺ بکە بۆ مێردی کچەکەی، بەڵکو خەڵك دەنێرێ بۆ ئەوەی بزانێ لە کوێیە، تا رازی بکات و دڵنەوایی بکات و کۆتایی بە ململانێ و کێشەکەیان بهێنێ.

نەك وەك هەندێ دایك و باوك، کاتێ گوێ لە سکاڵای کچەکەیان دەگرن راستەوخۆ دەست بە قسە وتن و نەفرین و جوێن دەکەن بە مێردی

کچەکەیان و زۆر بە ناشرینی باسی دەکەن، بەبێ ئەوەی گوێ بۆ وەڵام و بەرگریەکانی ئەویش بگرن، رەنگە کچەکەیان ستەمکار بێت و پێشێلی مافی بەرامبەری کردبێت، بەڵام ئەوان هەر زوو بە فرمێسکی کچەکەیان ئەخەڵەتێن، کە رەنگە فرمێسکە تیمساحی بێت.

لەو دیمەنەش جوانتر و نایابتر، ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ خۆی دەچێت بۆ لای مێردی کچەکەی کە لە مزگەوت خەوتووە و تۆز و خۆڵی لێ دەتەکێنێ و گاڵتەی لەگەڵ دەکات و بە نەرمی بانگی دەکات بە (أبو التراب) ئەو ناوەی کە سەهل دەڵێ: یەکێك بوو لە خۆشترین ناو لای پێشەوا عەلی.

ریوایەتەکان باسی ئەوەش دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی عەلی دەگرێت و دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ، کەمێك خۆی دوا دەخات، تا زاواکەی بچێتە ژورەوە و سڵاو لە هاوسەرەکەی بکات و ئەویش وەڵامی بداتەوە و کێشەکە کۆتایی بێت بەبێ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هۆکارەکەی بزانێت[1].

---

[1] بگەڕێوە بۆ پەڕاوی (في ذكرى المولد النبوي الشريف) ص٧٣.

سوپاس بۆ خوا هەر واش بوو، بەڕاستی موسڵمان پێویستی به چاولێکەری ئەو نمونە بەرزە هەیە بۆ مامەڵەی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئاوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێتە نمونە بۆ باوکی کچەکان کە چۆن مامەڵە لەگەڵ لەگەڵ زاواکانیان بکەن.

جێگەی خۆیەتی ئاماژە بە هەندێ هەڵوێستی تری پێغەمبەر ﷺ بکەین بەرامبەر عەلی رضي الله عنه و فاطمەی کچی، کاتێ دەزانێت لە نێوانیاندا کێشە هەیە، دەچێت بۆ ماڵیان و هەست بەو کێشەیە دەکات، دۆشەکێك هەڵدەدا بۆیان، عەلی لە لایەکی و فاطمەش لە لاکەی تری دادەنیشن.. هەستی کرد شتێ لە نێوانیاندا ماوە، دەستی عەلی گرت لەسەر ناوکی داینا بەو شێوەیە تا نێوانی سازاندنەوە و بە دڵخۆشی هاتە دەرەوە.

پێی وترا: کاتێ چویتە ژور شێوازێکت هەبوو، بەڵام بە روگەشی و دڵخۆشی هاتیتە دەر؟

فەرمووی: جا بۆ وانەبم، لە کاتێکدا نێوان دوو کەسم چاك کردەوە کە خۆشەویسترین کەسن لە لام.

ڕۆژێکیش پێغەمبەری خواﷺ دەچێت بۆماڵیان، دەبینێ (عەلی و فاطمە (ﭫ)). پێدەکەنن کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەبینن بێدەنگ دەبن، پێغەمبەر ﷺ پێیان دەفەرموێت: ئەوە بۆ پێدەکەنین و کە منتان بینی بێدەنگ بوون؟ فاطمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە قوربانت بم، عەلیﭬ وتی: من لە تۆ زیاتر پێغەمبەری خوام خۆش دەوێت، فاطمە ﭬوتی: من لە تۆ زیاترم خۆش دەوێت..

پێغەمبەرﷺ دەستی کرد بە زەردەخەنە و فەرمووی: ئەی کچم تۆ سۆزی منداڵت بۆ هەیە و عەلیش بەڕێزە لای من.

بەم شێوەیە ئەم خانەوادەیە چەند ساتێکی پڕ لە پێکەنین و شادی و خۆشییان بەسەر برد و جارجاریش ساتی وایان هەبووە خەریك بووە ئاوی رونی ژیانی خێزانی لێڵ ببێت[1].

---

[1] (فاطمەی کچی محمد) شیخ عبدالخالف شریف – ص٦٧-٦٨.

# بەشی سێیەم:

کۆمەڵە چیرۆکێکی راستەقینە لەسەر هاوسەر و خەزوران.

**یەکەم/** خاتوو فاطمە لەگەڵ خەسویدا.

**دووەم/** ئومامەی کچی حارث ئامۆژگاریی کچەکەی دەکات.

**سێیەم/** خەسویەك لە بەنی تەمیم ئامۆژگاری مێردی کچەکەی دەکات.

**چوارەم/** خەسوویەك مێردی کچەکەی ئاسودە دەکات.

**پێنجەم/** هۆنراوەیەك لە دایکێکی پیرەوە بۆ کوڕە سەرکەشەکەی.

**یەکەم/ خاتو فاطمە ﵂ لەگەڵ خەسویدا :**

پێکەوە لەگەڵ چەند ساتێکی ئەو ئافرەتە وەفادارە داین کە گەورەی ئافرەتانی جیهانە، نمونەی هاوسەری بەختەوەر و کچی چاکەکار لەگەڵ باوك، کچی خاتوو خەدیجە ﵂ کە لە دایکی بەوەفایەوە فێری ڕێز و چاودێری هاوسەرەکەی بوبوو.

بزانین مامەڵەی لەگەڵ خەسوی کە ناوی (خاتو فاطمەی کچی ئەسەدی هاشمی قوڕەیش)یە چۆن بووە، فاطمەی کچی ئەسەد هاوسەری (ئەبی طالب) ئەم ئافرەتە موسڵمان بووە لە مەککەوە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، پێغەمبەریش ﷺ زوو زوو دەچوو بۆماڵیان و نیوەڕۆ خەوی لەوێ دەکرد، لە دوای وەفاتی ئامینەی دایکی (ئەبو طالب) سەرپەرشتی برازاکەی (محمد کوڕی عبداللە)ی کرد، هاوسەرەکەی کە فاطمەی کچی ئەسەد بووە زۆر بە جوانی خزمەتی کرد.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ (ئەی دایکی بەڕێزم، ڕەحمەتی خوات لێ بێت، لە دوای دایکم تۆ جێگەی دایکمت گرتۆتەوە خۆت برسی دەکرد و منت تێر دەکرد، خۆت بێ بەرگ و منت پۆشتە دەکرد، خۆشیت لە خۆت دەگرتەوە و بە منت دەبەخشی و مەبەستیش تەنها ڕەزامەندی خوا بوو)[1] .

ئەوە فاطمەی کچی ئەسەدە، هەر لە سەرەتاوە بەرامبەر مێردەکەی میهرەبان و بەخشندە بوو، ئەمە پێش ئەوەی (محمد) ببێتە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە ستایشی دەکات، ئەمڕۆ کە باوەڕی بە پێغەمبەرێتی محمد هێناوە دەبێت چۆن بێت

کچەکەی پێغەمبەر ﷺ بە بوکی دێتەماڵیان و دەبێتە هاوسەری کوڕەکەی (عەلی ﷺ)، بۆیە زۆر خۆشحاڵ بوو کە چاودێری ئەویش بکات و خزمەتی بکات، هەروەك چۆن پێشتر خزمەت و چاودێری باوکی کردبوو .

---

[1] اخرجه الطبرانی ٣٥١/٢٤ – ابو نعیم في الحلية ١٢١/٣.

دەبێت ئەم خێزانە ژیانیان چۆن گوزەرابێت.

(عەلی کوڕی ئەبو طالب ﷺ) زۆر بە ژیرانە کار وبارەکانی ڕێك دەخات لە نێوان دایکی و هاوسەرەکەی و دەڵێت: دایکی بەڕێزم.. دەزانی کە فاطمە کچێکی منداڵە بۆ کاری دەرەوەی ماڵ کڕینی پێداویستی لە بازاڕ و ئەو جۆرە کارانە تۆ ئەنجامی بدە، فاطمە کاروباری ناوخۆی ماڵ ڕێکدەخات[1].

عەلی ﷺ کەسێکی هەژار بوو، لە ماڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ پەروەردە و گۆش کرابوو، چونکە ئەو کاتە باوکی ئەرکی زۆر و منداڵی زۆر بوو، پێغەمبەریش ﷺ وەك هاوکارییەك (عەلی ﷺ) هێنایە لای خۆی، کاتێ پێگەشت ژیانی (عەلی ﷺ) تایبەت کرا بە بانگەواز بۆ ئەم پەیامە مەزنە، پاشان کۆچکردن و قوربانیدان لە پێناو ڕێبازی خودا، وەك هەموو کۆچەرەکانی تر، لە مەدینە ژیان ئاسان نەبوو،

---

[1] صفة الصفوة – ابن الجوزي – ط١ – ١٩٩٩ ز.

جیهاد و تێکۆشان بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی ئیسلام دەستی پێکرد تا بەندەکان ئازاد بکەن لە بەندە پەرستی بۆ خودا پەرستی .

ئەو کاتە هۆکارەکانی ژیان و زیندەگی ئاسان نەبوو، ئاو هەڵدەگۆزرا و بە گۆزە و شتی تر هەڵدەگیرا، گەنم و جۆ پێویستی بە هاڕین و ئاش بوو، ئاش و بازاڕەکان بڵاو بوون لەدەرەوەی مەدینە، بۆیە دەرچون بۆ کڕینی پێداویستی بۆ ئافرەتێکی منداڵ بە تایبەت ماندوکەر بوو .

عەلیش توانای گرتنی خزمەتکاری نەبوو بۆ ئەو کارە، هەر خۆشی هەوڵی بژێوی ژیانی دەدا، هەروەها ئەرکی بەرامبەر دینەکەی جێبەجێ کردووە و تێکۆشاوە، لەسەرو ئەمانەشەوە پێویستە ئاسودەیی و ئارامی بۆ خێزانەکەی فەراهەم بهێنێ .

هەروەها فاطمە ئەرکی خۆی بەرامبەر دایکی و هاوسەرەکەی جێبەجێ دەکات، فاطمەی کچی ئەسەدیش کە دایکی پێشەوا

(عەلی ﷺ) و خەسوی (فاطمه ﷺ) بوو زۆر ڕێزی لە هاوسەری کوڕەکەی دەگرت.

بەم شێوەیە بە هەموویان توانیویانە ئارامی دڵ و ئاسودەیی خێزان لە لێڵی بپارێزن، ئایا ئێمە سودمان لەمانە وەرگرتووە؟!

خۆزگا مامەڵەی پێشینانمان دەزانی، کە چۆن ئارامی ماڵ و خێزانیان پاراستووە و لەسەر بناغەی سۆز و بەزەیی خێزانیان پێکهێناوە..

ئەوە بوومامەڵەی ئەم دوو فاطمەیە (بوك و خەسوو) بەرامبەر یەکتر، بەم شێوە دەژیان تا کاتێ مردن یەخەی فاطمەی کچی ئەسەد دەگرێت و بەرەو لای خوای خۆی دەگەڕێتەوە، ئەو کاتە پێغەمبەری خوا عەباکەی خۆی و کراسەکەی خۆی لەبەر دەکات و پێش ئەوەی بیخاتە ناو گۆڕەکە خۆی دەچێتە ناو گۆڕەکە و رایدەکێشێ و دەفەرموێت:

ئەی خوای گەورە کە مردن و ژیانت بەدەستە و دەمرێنی و دەژێنی و خۆت هەمیشە زیندویت و هەرگیز نامریت، پەروەردگار لە فاطمەی کچی ئەسەدی دایکم خۆش بیت و بەڵگەی رزگاری بدەیتە دەستی و زوبانی جێگیر بکەیت و گۆڕەکەی بۆ فراوانبکەیت بە هەقی پێغەمبەرەکەت و هەموو پێغەمەرانی پێش من ﷺ، بێگومان تۆ میهرەبانترینی میهرەبانەکانی .

پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن: ئەوەی لێرەدا کردت لە هیچ جێگە و شوێنێکی تردا نەمانبیستووە بیکەیت؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە دوای (أبوطالب) کەس بە ئەندازەی ئەم چاکەکار نەبووە لەگەڵمدا بۆیە کراسەکەی خۆمم لەبەرکرد تا لە خشڵ و بەرگی بەهەشت لەبەر بکات، بۆیەش لەناو گۆڕەکەیدا راکشام، تا سزای ناو گۆڕی لەسەر ئاسان بێت، خوای گەورە لە فاطمەی کچی ئەسەد رازی بێت[1] .

---

[1] بروانە (فاطمه بنت محمد) شیخ عبدالخالق شریف – ص٤٩/٥٢.

ئەوەی بەوردی سەیری ئەم خێزانە بەختەوەرە بکات کە گەورەی ئافرەتانی دنیا و مێردە لەخواترس و خواناسەکەی (عەلی کوڕی أبو طالب) دەبینێ هەر یەکێك لەوانە کاریگەری و دەوری چالاکانەی خۆی بینیوە بۆ ئاسودەیی ئەم خێزانە.

**مێرد:**

بەردی بناغەیە لە چالاککردنی پەیوەندی نێوان هاوسەر و دایکیدا، هەر لە سەرەتاوە بەرنامە ڕێژی دەکات و کاروبار فەرامۆش ناکات کە ڕۆژگار کار بەڕێ بکات، بەڵکو هەڵدەستێ بە ڕێخستنی ئیش و کارەکانی لە نێوان دایکی و هاوسەرەکەی.

بە نەرمی بە دایکی دەڵێ و بەڵگەی شیاو دەهێنێتەوە بۆ بەرنامەکەی، قسەکان ناداتە دەست هاوسەرەکەی، دەڵێ ئەو منالە و شەرم دەکات بچێتە بازاڕ و شتومەك بکڕێت.

پاشان کاروباری هاوسەرەکەشی ڕون دەکاتەوە کە ئامادەکردنی خواردن و شۆردنی بەرگ و خاوێن کردنەوەی ماڵ کە کاتی زۆرتریشی دەوێت.

**دایك:**

ئەم دایکە میهرەبانە (فاطمی کچی ئەسەد) بەرپەرچی ئەم ئەرکە نابێتەوە و بە قسەی کوڕەکەی بێزار و بێتاقەت نابێت، بەڵکو رازی دەبێت و بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵدەستێت و رۆژێ لە رۆژان لە کارەکەی خۆی هەڵنەهات و داواشی نەکرد هەموو کارەکان بدرێتە سەر هاوسەری کوڕەکەی، بەڵکو بەو شێوە مایەوە تا وەفاتی کرد، بەو شێوەیەش خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ رێزیان لێگرت و لە گۆڕەکەیدا راکشا و دوعای بۆ کرد.

**هاوسەر:**

خاتو فاطمەی کچی پێغەمبەر ﷺ کارەکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ ئارامی ئەمماڵە، بە تەواوی ئەرکی خۆی جێبەجێ کرد، هەرچەندە (عەلی رضي الله عنه) کەم سامان بوو- تەنها دۆشەکێکی پێستیان هەبوو کە لەسەری دەخەوتن، خزمەتکاریان نەبوو کاریان لەگەڵ ئاسان بکات، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا دڵخۆش بوو بە ژیانی خۆی هەر بەو منداڵیە ماندوو بوو، هەویری دەشێلا و نانی دەکرد و ماڵاتی بەخێودەکرد و ماڵی پاك و خاوێن دەکردەوە.

عەلیش لە دەرەوەی ماڵ ماندو دەوبوو کاری دەکرد، هەمیشە چاوەڕێی کرانەوەی دەرگای خێر و هیوا دەبون.

بێگومان منالّیش پێویستیان بە چاودێری و ماندوبون هەیە لەگەڵیان، چاوەڕێی دەرگایەکی خێر لەسەریان بکرێتەوە و بحەسێنەوە.

بەڵێ پێغەمبەری خواﷺ لە غەزایەکدا سەردەکەوێت و کۆمەڵێ ماڵ و سامان و خۆراك و بەندە و شمشێر و قەڵغانی دەست دەکەوێت، ئەم دوو هاوسەرە دەکەونە گفتوگۆ.

عەلی دەڵێت: ئەی فاطمە ئەوەندەم ئاو هەڵگرت و هەڵگوزی تا پشتم ئازاری تێکەوت، وا دەبینی دەستکەوتی زۆر لەبەردەستی باوکتدایە بۆ داوای خزمەتکاری لێ ناکەیت؟

فاطمە دەڵێ: بەڕاستی ئەوەندەم گەنم هاڕی پێستی دەستم لێ بۆوە؛ ئینجا فاطمە دەچێت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تا لەو بارەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکات.

ئەم باوکە بەخشندەیە لەدەم و چاوی کچەکەیدا شتێ دەخوێنێتەوە و هەست دەکات کە بۆ پێداویستی یەك هاتووە.

پێی دەفەرموێت: چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە ئەی فاطمە؟

دەڵێ: هاتم سلاوت لێ بکەم و هەواڵت بپرسم، شەرم زوبانی دەگرێ و داواکەی ناکات و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و عەلی هاوسەریشی چاوەڕێی دەکات بزانێ لەگەڵ باوکیدا چی گوزەراوە و داواکارییەکانی بۆ جێبەجێ کردووە.

پرسیاری لێ دەکات کە چی کردووە؟ وەلام دەداتەوە شەرمم کرد کە داوای لێبکەم؟!

ئینجا گفتوگۆ دەکەن و دەگەنە ئەوەی هەردوکیان بچن و پێغەمبەر ﷺ ببینن تا هانی یەکتر بدەن بۆ داواکەیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، دەچن و داوای مۆڵەت دەکەن، پێغەمبەریش ﷺ مۆڵەتیان دەدات.

عەلی رضي الله عنه دەڵێ: سوێند بە خوا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندەم ئاو دەرهێنا پشتم ئازاری پێ گەیشتووە، فاطمە رضي الله عنها وتی: ئەوەندەم گەنم هاڕی پێستی دەستم لێبۆوە، وا خوای گەورەش دەرگای خێری زۆری لەسەر کردویتەوە، خزمەتکارێکمان پێ ببەخشە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (سوێند بە خوا بە ئێوەی نابەخشم لە کاتێکدا ئەهلی صوففە سکیان هەڵبگوشن، منیش هیچم نەبێت کە پێیان ببەخشم، بەڵکو بەندەکان دەفرۆشم و دەیکەمە نەفەقە بۆ ئەهلی صوففە.

بڕوانە هەستی بەرپرسیارێتی کاربەدەستی موسڵمان بەرامبەر گەلەکەی؟ هەستێك لە هەژارانی ژێر دەستی بەلاوە گرنگترە، وە خەمخۆری و دڵسۆزی بۆ ئەوان بەسەر کچ و هاوسەرەکەیدا پێش دەخات.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە خێزان و کەسی خۆی جیاناکاتەوە و شتێکیان پێ نابەخشێ کە مافی خۆیان نییە

ئەمە لە کاتێکدا کە (عەلی و فاطمە) لە موسڵمانە پێشینەکانن و لە پێناوی خوادا تێکۆشاون، کۆچیان کردووە، عەلی لە جێگەی نوستنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەنوێت لە شەوی هیجرەتدا، لەو کاتەدا کە لاوە خەڵەتێنراوەکانی قورەیش دەوری ماڵیان داوە بە نیاز بوون پێغەمبەر ﷺ بکوژن، ئەو عەلی یەی تێکۆشا و جەنگا لە رۆژی بەدر، ئەو عەلییەی لە رۆژی ئوحود جەنگا و تێکۆشا،

دەبێت ئاو بە شانی هەڵبگرێت، فاطمەش خۆی گەنم بهاڕێ و بیکات بە هەویر و نان، بەڵام ماڵ و سامانی موسڵمانان، دەبێت بدرێ بە هەژارەکان و ئەوان لە پێشترن، ئەو هەژارانەی بە (أهل الصفه) ناسرابوون و خۆراك و جێگەی حەوانەوەیان نەبوو.

ئایا لە دنیادا کاربەدەستێکی موسڵمان هەیە ئەم هەستە ناسك و جوانەی هەبێت و فەزڵی هەژاران بدات بەسەر ماڵ و منداڵی خۆیدا؟ ئەمە تەنها هەستی کەسێکە کە چاوی لە پاداشتی پەروەردگار و رۆژی قیامەت بێت.

(عەلی و فاطمە (ﷺ)) رازی بوون بە بڕیاری خودا و پێغەمبەرﷺ و گەڕانەوە بۆ ماڵ، بەڵام ئایا پێغەمبەرِی بە رەحمەت نێردراوﷺ ، بە سۆز و میهرەبان کارێك نەکات کە بە رەحمەتی پێغەمبەرێتی دڵیان بگەشێتەوە و دەرونیان ئارام بکاتەوە، بەڵێ لە دوای ئەوان پێغەمبەرﷺ بەرەو ماڵیان دەڕوات و دەچێتە ژور، ئەو ماڵەی کە تەنها پارچە قوماشێکیان هەبوو، ئەگەر بەسەر خۆیاندا ئەدا قاچیان دەرئەکەوت، ئەگەر قاچیان دائەپۆشی سەریان دەرئەکەوت.

کاتیٚ پیٚغەمبەری خوایانﷺ بینی، گورج هەستان بەوپەڕی ڕیٚز و سۆز و خۆشەویستی پیٚشوازیان لە سەرکردەکەیان کرد.

ئەویش فەرمووی: مەجولیٚن، ئایا پیٚتان بلیٚم شتیٚ کە چاکتر بیٚت لەو داوایەی ئیٚوە کردتان؟

وتیان: بەلیٚ، فەرمووی: چەند وشەیەکن کە جبریل فیٚری کردم.

دوای هەموو نویٚژیٚك دە جار (سبحان الله) و دە جار (الحمد لله) و دە جار (الله اکبر) بلیٚن، وە کاتیٚك چونە سەر جیٚگە ٣٣ جار (سبحان الله) و ٣٣ جار (الحمد لله) و ٣٣ جار (الله اکبر) بلیٚن، ئەوە لە خزمەتکوزاریٚك چاکترە بۆ ئیٚوە[١].

چەند جوانە ئەم میهرەبانیە، چەند گەورە و مەزنە ئەم ڕیٚنمونیە، چۆن گەورە نەبیٚت کە ڕیٚگەیەکە پیٚغەمبەر ﷺفەرموویەتی.

باشتر لە داواکەی خۆیان پیٚ دەبەخشیٚت.

پیاویٚك لە (عەلی) دەپرسیٚ: ئایا ئەو ئامۆژگارییەت جیٚبەجیٚ کرد و بەگویٚتان کرد؟

---

[1] صحيح الباري – باسی (على بن ابي طالب) (٣٧٠٥).

عەلی دەڵێ: سوێند بە خوا لەو ساتەوە فێری بووم وازم لێ نەهێناوە، هەتا لە رۆژی (صفین)یشدا جێبەجێم کردووە[1].

ئەم ئامۆژگارییەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کچەکەی و هاوسەرەکەی، پەند و ئامۆژگاری تیایە بۆ هەموو ئافرەتێك کە ئەرکی سەرشانی لە نێو ماڵدا قورسە و ئیشی زۆری هەیە و پێڕاناگات، پێویستە یادی خوا بکات پێش نوستن و دوای نوێژەکان، بەڕاستی دەرمانێکی شیفابەخش و ئەزمونکراوە بۆ کەسێ شکاتی حاڵی خۆی بکات.

خۆزگە ماڵە موسڵمانەکان لەم خانەوادە بەڕێزەوە فێری بنەماکانی تەقوا و وەفاداری و هاوکاری لە نێوان ژن و مێرد و خەسودا دەبون.

---

[1] رواه احمد في المسند (١٠٦/١).

**دووەم:**

## نومامەی كچی حارث ئامۆژگاری كچەكەی دەكات

له پەڕاوی (المستطرف في كل فن مستطرف) نوسراوە:

كاتیٚ (عەمر كوڕی حجر كەنەدی) داخوازی كچی (عەوف كوڕی مەلحەمی شەیبانی) دەكات كە ناوی (أم أياس)، ئەویش وەڵامی دەداتەوە، ئەو شەوەی دەیگوازنەوە دایكی دەچێتە لای كچەكەی و ئامۆژگاری دەكات و دەڵێت: كچەكەم.. تۆ ئێستا لەو ماڵە دەڕۆیت كە تیایدا لەدایك بویت، ئەو لانەیە بەجیٚ دەهێڵیٚ كە تیایدا گەورە بوویت، دەچیتە لای پیاوێك نایناسی، لای دۆستی كە لەگەڵی ڕانەهاتوی، تۆ بە كەنیزەك بۆ ئەو، دڵنیابە ئەویش دەبێتە بەندەی تۆ وە ئامۆژگاریت دەكەم دەشتی ئەو پیاوە بپارێزە دەبێتە توێشو بۆت.

**یەكەم و دووەم:** قەناعەتت هەبێت و رازی ببە و گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بە.

**سێیەم و چوارەم:** وریای چاو و لوتی بە با چاوی بە شتیٚ نەكەویٚ لە تۆدا كە نەشیاو ناشرین بێت، وە بۆنی شتیٚ لە تۆدا نەكات جگە لە بۆنی خۆش و ئارام بەخش.

**پێنجەم و شەشەم:** وریای کاتی خواردن و خەوتنی بە، چون برسێتی بڵێسەی ئاگرە، وە بێ خەویش مرۆڤ تورە دەکات.

**حەوتەم و هەشتەم**: پارێزەری ماڵ و سامانی بەو چاودێری خێزان و منالەکانی بکە.

**نۆیەم و دەیەم:** بێ فەرمانی مەکە و نهێنی مەدرکێنە و ئاشکرای مەکە ئەگەر بێ گوێیت کرد دەرونی پڕ لە کینە دەکەیت ئەگەر نهێنی ئەوت درکاند و بڵاوکردەوە لە خیانەتی پارێزراو نابیت.

و لە کۆتایدا ئامۆژگاریت دەکەم هەرگیز کاتێ ئەو دڵتەنگ و بێتاقەت بوو دڵخۆش و شادی مەنوێنە.

وە کاتێ ئەو شاد و دڵخۆشە، تۆ بێتاقەت و غەمگین مەبە.

ئەویش ئامۆژگارییەکانی بە جوانی وەرگرت و پاراستی، سەرەنجام لەو پیاوە (حارثی کوڕی عەمری بوو، کە دەکاتە باپیری (أمرؤ القیس) کە پاشای شاعیرانە.

**سێیەم:**

**خەسوەکانی (بەنی تەمیم) ئامۆژگاری مێردی کچەکانیان دەکەن.**

هەیثەمی کوڕی عەدی طائي[1] لە شەعبی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕۆژی (شورەع)م پێگەیشت پێی وتم: ئەی شەعبی، ئافرەتانی بەنی تەمیم بخوازە.

وتم: چیت لێ بینیون؟

وتی: نیوەڕۆیەك لەگەڵ جەنازەیەکدا بوین بە کۆڵانێکدا بردمان، کتوپڕ ئافرەتێکی پیرم لەبەر دەرگایەکدا بینی، لە تەنیشتیەوە کەنیزەکێك هەبوو، زۆر جوان بوو منیش چوومە لایان و هەرچەندە تینوش نەبوم بەڵام داوای ئاوم کرد.. پێی وتم: چ خواردنەوەیەکت دەوێت؟

وتم: هەرچیەك ئامادە بێت..

وتی: ئەی کەنیزەك بڕۆ شیری بۆ بێنە، من وا گومان دەبەم، ئەم پیاوە نەناس و ڕێبوارە.

وتم: ئەم کەنیزەکە کێیە لای تۆ؟

---

[1] هیثم کوڕی عەدی کوڕی عبدالرحمن ثەعلەبی طائي البحتري، مێژوو نوس و زانا و ئەدیب، ساڵی ٢٠٧ لە نزیك (واسط) کۆچی دوایی کردووە.

وتی: ئەو زەینەی کچی جەریر یەکێکە لە ئافرەتانی (بەنی حنظلة)

وتم: بێ کارە یان کاری هەیە؟

وتی: بێکارە.

وتم: دەمدەنێ بیخوازم؟

وتی: ئەگەر هاوشانی بێت؟

هەستم کرد بە زوبانی (بەنی تەمیم) قسە دەکات بۆیە وازم لێهێنا و گەڕامەوە بۆ ماڵ بۆ ئیسراحەتی نیوەڕۆ بەڵام نەمتوانی بخەوم، کاتێ نوێژی نیوەڕۆم کرد چوومە لای کۆمەڵێ پیاوماقوڵ و ریشسپی عەرەب کە (عەلقەمە و ئەسوەد و موسەیب) بوون، چوین بۆ ماڵی مامی و ئەویش پێشوازی لێکردین و وتی: ئەی (ئەبا ئومەیە) کارت چییە؟ وتم: هاتووم بۆ داخوازی زەینەبی برازات، ئەویش پێشکەشی کردم، کاتێ کارمان تەواو بوو لە دڵی خۆمدا پەشیمان بوم و وتم: من چیم داوە بەسەر ئافرەتانی (بەنی تەمیم)، بیری دڵرەقی ئەوانم کردەوە، وتم: تەلاقی دەدەم، پاشان وتم: نەخێر، با بیگوازمەوە ئەگەر هەڵسوکەوتیم بەدڵ بوو باشە، ئەگەر بەدڵم نەو تەلاقی دەدەم.

خۆزگە ئاگات لێم دەبوو کاتێ ئافرەتەکانیان رازاندبویانەوە و هێنایان بۆ لام وتم: سونەت وەهایە ئەگەر ئافرەت هاتە لای

مێردەکەی، بچێت دەستنوێژ بگرێت و دو رکات نوێژ بکات و داوا لە خوا بکات خێری توش بهێنیّ و لە خراپە بیانپارێزیّ.

بۆیە هەستام دەستنوێژم گرت، بینیم ئەویش دەستنوێژ دەگرێت، نوێژم کرد ئەویش لەگەڵمدا نوێژی کرد، کاتیّ نوێژمان تەواو کرد، ئینجا بەرگێکی جوانی زەعفەرانیان بۆ هێنام و پاشان میوانەکان رۆیشتن.

کاتیّ لێی نزیك بومەوە دەستم برد بۆ ناوچاوانی، وتی: لەسەرخۆبە و نەرم و نیان بە ئەی (ئەبا ئومەیە) پاشان وتی: سووپاس بۆ خوا، درود لەسەر (محمد) و ئال و بەیتی لە پاشان:

بزانە کە من ئافرەتێکی غەریب و نەناسم، رەوشت و هەڵسوکەوتی تۆ شارەزا نیم، حەز دەکەم ئەو شتانەی پێت خۆشە بۆم باس بکەیت، تا وا بکەم، ئەو شتانەیش کە پێی بێتاقەت دەبیت بزانم تا خۆمی لیّ بپارێزم، چونکە تۆ لە هۆزەکەی خۆت ئافرەتت بووە، منیش بە هەمان شێوە، بەڵام بڕیاری خوا چۆن بوو، هەر ئەوە رودەدات، من ئێستە هی تۆم، بەو شێوە بکە کە خوای گەورە فەرمانی پێداوی، یان گرتنێکی جوان، یان جیابونەوەیەك لەسەر چاکە..

ئەمە قسە و گوفتاری من بوو، داوای لێخۆشبوون لە خوای بالآدەست دەکەم بۆ خۆم و هەموو موسڵمانان.

دەڵێ: ئەی شەعبی سوێند بە خوا بەو وتانەی زۆر سەرسام بووم.

منیش وتم: سوپاس و ستایش بۆ خوا و پشت و پەنامان هەر ئەوە، سلآوات بۆ سەر گیانی محمد و ئال و بەیتی، لە پاشان: بەڕاستی تۆ قسەیەکت کرد کە ئەگەر وابیت ژیانت لەگەڵ مندایە، ئەگەر وازیشی لێ بهێنی دەبێتە بەڵگە بەسەرتەوە.

بۆیە بزانە من فلآن شتم لا خۆشەویستە و ئەو شتانەشم لا ناخۆشە.

ئەگەر چاکەیەکت لە من بینی ئاشکرای بکە، وە ئەگەر خراپە و هەڵەیەکت بینی داپۆشە و بە نهێنی بهێڵەوە.

وتی: زیارەت و سەردانی کەس و کارم بەلاتەوە چۆنە؟

وتم: حەز ناکەم هێندە سەردان بکەن کە بێزارم بکەن.

وتی: ئەی دراوسێکانت، کە دێن مۆڵەتی کامیان بدەم، وە کامیانت بەدڵ نییە با بزانم؟

وتم: فلآن چاکن و فلآنیش باش نین.

ئینجا وتی: ماوەی ساڵێك لەگەڵی مامەوە جگە لەو شتانەی لام خۆش بوو، شتێکی ترم لێ نەبینی.

لە سەری ساڵدا لە کۆڕی (قەزا) هاتمە دەر ئافرەتێکی پیرم لە ماڵمان بینی، کە فەرمانی دەکرد ئەوە بکە و ئەوەش مەکە؟

وتم: ئەمە کێیە؟

وتیان: فلان کەسی خەسوتە (دایکی خێزانت)

وتم: یاخوا بەخێربێیت، کە دانیشتم روی تێکردم.

وتی سەلامی خوات لیّ بێت ئەی باوکی ئومەییە.

وتم: سەلامی خواش لە تۆ بێت خێر و خۆشیت هێنابێت.

وتی: هاوسەرەکەت چۆن هەڵدەسەنگێنی.

وتم: باشترین هاوسەر و هاوەڵ بەڕاستی زۆر بە جوانی پەروەردەت کردووە، زۆر جوان وەرزشی ژیانت پیّ کردووە، خوای گەورە پاداشتی چاکەت بداتەوە.

وتی: ئەی باوکی ئومەییە ئافرەت لە دوو کاتدا لە خۆی دەگۆڕیّ و خراپ دەبێت.

وتم: چین.؟

وتی: ئەگەر کوڕێکی بوو یان جێی رەزامەندی مێردەکەی بوو، بەڵام ئەو رەزامەندیە بووە مایەی سەرکەشی ئافرەتەکە، جا ئەگەر شتی ناشایستەت بینی دەبێت ئامۆژگاری و تەمێی بکەیت،

بەڕاستی پیاوان لەوە خراپترنیە کە لە ماڵەکانیاندا ئافرەتی نازدار و نازپێدراوی دڵ قایم هەبێت.

وتم: سوێند بە خوا، تۆ بە راستی جوان پەروەردەت کردووە و ئەدەبت فێر کردووە.

وتی: چۆنت پێخۆشە کەس و کاری هاوسەرت سەردانت بکەن؟

وتم: هەرچۆنێك پێیان خۆشە.

ئیتر هەموو سەری ساڵێك دەهاتن بۆ لام و ئامۆژگاری دەکردم، ئەی شەعبی، ئەو ئافرەتە ماوەی بیست ساڵ لەگەڵی ژیام هیچ کەم و کوڕیەکم لیٚ نەبینی، بەڵام دراوسێیەکمان هەبوو لە (کندە) هەمیشە هەڕەشەی لە هاوسەرەکەی دەکرد و لێی دەدا، منیش لەو بارەیەوە وتم:

دەبینم پیاوانێك دەدەن لە هاوسەرانیان

گەر رۆژێك لە زەینەبمدا دەستم لە کار بکەویٚ

ئایا بە بیٚ گوناهێك لە خۆڕا لێی بدەم؟

کەی دادپەروەرییە لێدان لە کەسی بێتاوان

زەینەب خۆرە و ئافرەتان ئەستێرەن

ئەگەر ئەو هەڵهات ئەستێرە نامێنن.[1]

---

[1] المستطرف في كل مستظرف / ص٨٥١ – ٨٥٢.

**چوارەم:**

## خەسویەك مێردی كچەكەی بەختەوەرە دەكات.

هەندێ لە هاوسەران ئەم چیرۆكە دەگێڕنەوە و دەڵێن لە گوندەكەماندا عادەت وایە، وەك زۆرێك لە گوندەكانی (میصر) كە كوڕ لە ماڵی باوكی ژن بهێنێ، برا بچوكەمەم پێش من ژنی هێنا لە كە ئافرەتێكی پاك و چاك لە خێزانێكی چاك.

لە دوای ساڵێك و بەهۆی جیاوازیەكی تەقلیدی هاوسەری براكەم رۆشتەوە بۆ ماڵی باوكی منیش چووم بۆ ماڵی خەزورانی براكەم بۆ گێڕانەوەی براژنم بۆ ماڵەوە.

باوكی زۆر بە گەرمی پێشوازی لێكردم و كچەی بانگ كرد كاتێ كچەكەی ویستی قسە بكات وتی: بێدەنگ بە و هەستە لەگەڵ برای مێردەكەت بگەڕێوە، جارێكی تر بەو شێوە نەگەڕێیتەوە، خەسوت لە جێگەی دایكتە و لای من زۆر بەڕێزە.

بەڕاستی ماوەی (٣٠) ساڵ بەسەر ئەم هەڵوێستەدا پێپەڕیبوو، یەك جیاوازیم لە نێوان دایكم و براژنەكەم نەبینی.

منیش دوای دووساڵ لە ژن هێنانی براكەم، بوومە خاوەنی هاوسەر و لە شاردا دەژیام، دایكم رۆژانی پێنج شەممە سەردانی دەكردین و هەمیشە بە دەستی قورس و عەلاگەی پڕەوە دەهات،

منیش رۆژانی پێنج شەممە دەگەڕامەوە لە کارەکەم بۆ ئەوەی دایکم ببینم و پێکەوە لەسەر خوانێك کۆببینەوە و لەگەڵی شاد و دڵخۆش بم و گوێ بیستی نزاکانی بم، پاشان بە سەلامەتی و خۆشی دەگەڕاینەوە بۆ گوند.

پێنج شەممەیەك کە گەڕامەوە عەلاگەکانم بینی، بەڵام دایکم نەبینی!!، لە هاوسەرەکەم پرسی ئەویش وتی گەڕاوەتەوە بۆ گوند، زانیم کە تورەی کردووە بۆیە گەڕاوەتەوە، کاتێ گفتوگۆم لەگەڵ کرد دەنگی بەرز کردەوە و زۆر بە تورەیی وتی: ئێستا خۆم ئامادە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ سەر کاری خۆم، تۆش نامەی تەڵاقەکەم بۆ بنێرە!! هیچ وەڵامم نەدایەوە و گوێم پێ نەدا.

دوای عەسر بینیم وا دایکی زۆر گەورە و بەڕێزی دەستی کچەکەی گرتووە و هێنایەوە، وتی: هەرچی پێویست دەکات لەگەڵی بیکە، با فێر بێت چۆن ڕێزی خەسووی دەگرێت، وە دەبێ دایکت و باوکت سبەینێ لێرە ئامادە بن تا داوای لێبوردنیان لێبکات، لە دوای ئەوەش دایکی سور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت کچەکەی (هاوسەرەکەم) لەگەڵ دایکم بچن بۆ (عەمرە) بۆ ئەوەی لەوێ خزمەتی بکات، ئەویش خوای گەورە ڕێکی خست، کاتێ کە گەڕانەوە وەکو دوو خوشك دەژیان کە ژیانیان پڕ لە مانای

جوان كردبوو، ئیتر منیش لەبەر ئەو مامەڵە جوانانە لە هەندێ شتی هاوسەرەكەم دەبوردم چونكە هەڵوێستی دایكی زۆر جوان بوو.

رۆژان رۆشت، دایكم نەخۆش كەوت و لە ژوری بوژانەوەی دڵ خەوێنرا، چونكە توشی جەڵدەی دەماخ بوبوو، كاتی گەڕامەوە خێزانەكەم لە ناو منداڵەكاندا نەبینی، بەڵام خەسوم لەگەڵیاندا بوو، برای هاوسەرەكەم بە سەیارەكەی خۆی بردمی بۆ نەخۆشخانە بینیم هاوسەرەكەم لەسەر كورسییەك لە تەنیشت دایكمەوە دانیشتووە و دەستی گرتووە، لەو كاتەدا نەمدەزانی چۆن سوپاس و ستایشی ئەو هەڵوێستە جوان و چاكەی هاوسەرەكەم بكەم.

**پێنجەم:**

## پارچە هۆنراوەیەك لە دایكێكەوە بۆ كوڕە سەركەشەكەی

ئەم هۆنراوەیە مامۆستا (نادر عبدالحكیم یوسف) نوسیویەتی كە باس لە چیرۆكی ئافرەتێكی بە تەمەن دەكات كە ژنی كوڕەكەی دەری كردووە و ئەمەیش چۆتە خانەی بەتەمەنەكان و بە زوبانی حاڵ دەڵێ.

ئەی حمدان تۆ لە کوێی دایکت بانگت دەکا

ئەڵێی هاوار و بانگیت پیٚ ناگا

ئەی کورِم دڵم هەمیشە داوات دەکا

تۆ هەرگیز لەبەر چاوم ون نابی

ئەوە سیٚ ساڵە چاوم بۆت دەگری

بەڵام نەمبینی زیارەتیٚ بکەی

بیری رۆژانیٚ کە داردارەم پێدەکردی

لە دوام دەرِۆشتی و یاریم لەگەڵ دەکردی

هەمیشە بە دەنگی من لە ئامێزی مندا دەخەوتی

کەس جگە لە من ئارامی پیٚ نەدەبەخشی

کاتی نەخۆشیت لە نزیکت دەرمانم دەکردی

چێژی خەو نەبوو، نە ئێوارە نە بەیانی

مەخابن ئەمرِۆ منت فرۆشت و رۆشتی

بویتە دڵسۆز و وەفاداری هاوسەرێتی

من دەزانم ئەو دڵرەقە و واز ناهێنیٚ

دەڵیٚ ئەم پیرە لەگەڵ مندا مەحاڵە نابیٚ

لە خانەی پیران بەجێت هێشتم و تکام لێکردی

ئـــەمەیە پاداشتی چـــاکە و پیـــاوەتی

خۆزگە خزمەتکاری بەردەستت دەبوم

تا هەموو رۆژێ بە دیدارت شاد دەبوم

سوپاس ئەی کورم، سوپاس بۆ هەوڵەکانت

داوا لە خوا دەکەم هەمیشە بۆ هیدایەتت

حەمدان ئەی حەمدان دایکت ئامۆژگاریت دەکات

دەترسم ئەم وەصیەتەم پێت نەگات

لە پزیشکی خانەم داواکرد پێت بدات

پەیامەکەم کە بە فرمێسکی چاو نوسراوە

ئەگەر مردم لە دوعا بێ بەشم مەکە

داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە ئەمەم رجایە

خۆڵی گۆرم بە فرمێسکی چاوت تەرکە

بەڵام بزانە پەشیمانی لە کۆتا بێسودە.

# بەشی چوارەم

**گرفتەکانی نێوان ژن و مێرد لە گەڵ خەزورانیان هۆکار و چارەسەر**

**یەکەم/** هۆکارەکانی کێشەی نێوان ژن و مێرد لەگەڵ خەزور و خەسویاندا

**دووەم/** دیاردە و شوێنەوارەکانی ئەم گرفتە

**سێیەم/** چارەسەری ئەم گرفتە

## گرفتەکان

بێگومان گرفتی نێوان ژن یان پیاو لەگەڵ خەسو کۆمەڵێ هۆکاری هەیە، هەندێ جار دەگەڕێتەوە بۆ ژن و مێرد، هەندێ جاریش بۆ خەسوو

ئەویش لەو باسەدا رۆشن دەبێتەوە کە باسی هۆکارەکان دەکەین و هەوڵی چارەسەریش دەدەین.

## یەکەم/ هۆکاری گرفت لەگەڵ خەسوو.

کۆمەڵێ هۆکار هەن کە دەبنە مایەی دروست کردنی گرفت و کێشەی بەردەوام، هەندێ جار پەیوەندی بە خودی هاوسەرەکان یان خەسوەکانەوە هەیە، لەو هۆکارانە:

### لاوازی کەسێتی پیاو بەرامبەر دایکی یان هاوسەرەکەی.

ئەمەش لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە لە منداڵییەوە دایك بە شێوەیەکی زۆر ناسك کوڕەکەی پەروەردە دەکات کاتێ گەورە دەبێت تەنها لاشەیەکی بەتاڵ لە ناوەڕۆك دروست دەبێت و هیچ ئیرادە و ویستێکی نابێت، وەك بوکە شوشەیەك چاوەڕێی

جوڵەیەکە لە دەرەوەی خۆی ئاڕاستەی بکات، ئەمەش دەبێتە خاڵێکی لاواز و سەلبی و سارد لە ژیانیدا، ئیتر ناتوانێ ببێتە ئەو پیاوەی کە توانای بڕیاردانی هەبێت.

ئەمەش بەهۆی چەند خاڵێکەوە دروست دەبێت:

### ١. مردنی زووی هاوسەر

جاری وا هەیە مردنی هاوسەر لە سەرەتای ژیانی هاوسەرێتیدا دەبێتە مایەی دڵڕاوکێ لە ژیانی خێزاندا، بەتایبەت ئەو هاوسەرە لاوانەی کە ئامادە نییە شوبکاتەوە، چونکە ژیانی خۆی وەقف دەکات بۆ پەروەردە کردنی منالەکانی و بە ئەرکی باوکیش و دایکیش هەڵدەستێ.

ئیتر دەسەلاتێکی فەرمان و رێگرتن بە دەست دەهێنێ و لە ترسی زیان و سوور بوون لەسەر قازانجیان دەست دەخاتە هەموو ژیانیان، کاتێ منداڵەکان گەورە دەبن و ژیانی هاوسەری دروست دەکەن وا هەست دەکات منالەکانی لە دەست دەچێت بۆیە دەست دەخاتە کاروباری ژیانیان، تا وا هەست بکات کە هێشتا لێی نزیکن و ملکەچی ئەون.

### ٢. غیرەی خەسوو یان ژن.

جاری وا هەیە خەسو غیرە دەکات لە ژنی کوڕەکەی جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە، خەسوو وا دەبینێ کە ئەو دایکی ئەو کوڕەیە و خاوەنی مافە لە بەرامبەر ئەو کوڕە، هاوسەریش وا دەبینێ کە ئەم هاوسەری ژیانێتی و نابێت کەس بەشداری ژیانیان بکەن با دایکیشی بێت.

### ٣. جیاوازی واتای خۆشەویستی لە لای ژن و دایك

هەندێ جار یەکێك لەوان وا لە خۆشەویستی تێدەگات کە بریتیبێت لە دەستبەسەرا گرتن و زاڵ بوون ، ئەوەیان بیردەچێتەوە کە خۆشەویستی بریتیە لە بەخشین.

### ٤. یەکێك لەوان هەر لە سەرەتاوە خۆپارێزی هەیە لە بەرامبەرەکەی.

جاری واش هەیە ئەم حاڵەتە دەبێتە بەربەست لە نێوانیان، هەرچەندە بەرامبەرەکەی بیەوێت خۆشەویستی و ڕێز ئاراستەی بکات بەڵام ئەو هەر دورە پەرێز دەگرێت و لەم بارەشەوە نمونە زۆرە.

### ٥.کێشەی نیشتەجێ بوون و لاوازی باری ئابوری و کۆمەلایەتی.

شوێنی نیشتەجێبوون لە گەورەترین هۆکارەکانی کێشەی نێوان ئەو دووانەیە (بوك و خەسو)، لە کاتێکدا دایك لەگەڵ کوڕەکەی و هاوسەرەکەی پێکەوە دەژین، ئەمەش دەبێتە هۆکاری گرفتی گەورە، چونکە دایك خۆی بە گەورەی ماڵی کوڕەکەی دەزانێت، ژنی کوڕەکەش خۆی بە لێپرسراوی ئەو ماڵە دەزانێ و لای وایە دەبێت بڕیاردەری تەنها بێت و کاروباری ماڵ ئەو رێکی بخات.

### ٦. کۆمەڵێ پابەندی کۆمەڵایەتی قورس.

زۆر کۆمەڵگە هەیە کە خاوەنی کۆمەڵێ عادات و خوی کۆمەڵایەتی زۆر قورسن، کە وا دەکات دایك دەست بخاتە وردەکاری ژیانی منداڵەکانی بە چاك و خراپ، ئەمەش عاداتی کۆمەڵگە دروستی کردووە، لەگەڵ بونی چەند گرفتێکی دەرونی و تێنەگەیشتن لە جۆری پەیوەندی نێوان باوك و دایك لەگەڵ منداڵەکانیان.

### ٧. نەبونی تێگەیشتنێکی تەواو.

زۆر خەڵك، ئافرەتانیش لە نێو ئەواندا پێویستیان بە تێگەیشتنێکی وردتر و سەیرکردنی سەرەنجامی کار هەیە، وە دیدێکی فراوانیان هەبێت تا شتەکان بگەڕێنەوە بۆ چوارچێوەی راستەقینەی خۆی.

دەبێت بڕیار بدەن هۆکاری کارئاسانی بن و ئەرکی سەرشانی کوڕ یان هاوسەر سوك بکەن نەك خۆشیان ببنە هۆکاری قورس کردن و قوڵ کردنەوەی کێشەکان.

نابێت دایك بە بەهانەی یارمەتی دانی کوڕ دەست وەربدات لە کاروباری و بە چاك و خراپ ئاراستەی بکات کە کارە ترسناکەکە لێرەوە دەست پێدەکات، جاری واش هەیە ئەو دایکە خاوەنی کۆمەڵێ سیفات و نەخۆشی دەرونییە.

کە لەو رێگەوە کاریگەری دەبێت بە شێوەیەکی خراپ جا خۆی هەستا بکات یان نا.[١]

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ بابەتێك لەلایەن (علي رضوان الخطيب) بە ناونیشانی (الحماة رحمة ام نقمة) على موقع www.islam.web.net

## بۆچونی زانایانی کۆمەڵناس و دەرونی دەربارەی هۆکارەکانی جیاوازی.

بیروڕای ئەو زانایانە دەربارەی هۆکارەکانی جیاوازی لە نێوان هاوسەر و خەسوویاندا، زۆر جیاواز نییە لەوەی ئێمە پێشتر ئاماژەمان پێکرد، بەڵام بۆ سودمەندبوونی زیاتر باسیان دەکەین.

**مامۆستا و دکتۆر (أحمد ئەلمجدوب) - مامۆستای زانستی کۆمەڵناسی لە (مرکز البحوث الأجتماعية):**

دەڵێت: هۆکاری بنەڕەتی ئەو جیاوازیە هۆکارێکی دەرونی و کۆمەلآیەتییە، دایك ئەو کەسەیە منداڵی بووە، پەروەردەی کردووە، شەوبێداری بۆ کردوو، ژیانی بەخشیوە، وا دەڕوانێ کە ئەو کوڕە موڵکی ئەوە، ئەو ئافرەتە کە (خێزانەکەیەتی) هاتووە لێی بدزێت، بەڕاستی ئەگەر ئەو دایکە بیرێك لە رابردووی خۆی بکاتەوە کە ئەویش ئافرەتێك بووە کە کوڕێکی لە دایکی سەندووە، ئەو کاتە ئاسایی دەبو لەلای، کەواتە گەشەکردنی کۆمەلآیەتی بناغەی ئەم گرفتەیە، کاتێ کوڕ گوێی لە دایکی دەبێت بەم شێوەیە کە بڵێت: تۆ دەچی بۆ لای ئەوان و ئێمە بە تەنها

جێدەهێڵی، ئەو پارەش کە بۆ ئەوانی خەرج دەکەیت، ئێمە لە پێشترین.

ئەمە وادەکات ئەم مناڵە کاتێ گەورە دەبێت و ژن دەهێنێ و هەمان قسەی لە ژنەی دەبیستێ، سەرسام نابێت و ئەم قسەی بەلاوە نامۆ نییە، چونکە پێشتریش هەمان قسەی لە دایکی بیستووە.

لەگەڵ ئەمانەشدا دوری ئافرەت لە دنیای رۆشنبیری هۆکارێکی ترە: ئافرەت ئەگەر بەرنامەیەکی خۆ رۆشنبیرکردنی نەبوو، یان سەرقاڵی هیوا و ئاواتێك نەبوو، وە لەگەڵ کوڕەکەی و بوکەکەی دەژیا، لەم بۆشاییەدا، دەست دەکات بە چاودێری و تێبینی زۆر ورد لە سەریان و خۆی پێوە سەرقاڵ دەکات، پاشان دەست دەکات بە چەسپاندنی مافەکانی بە هەرشێوەیەك بێت و زۆر جار لەو پێناوەشدا قوربانی بە ژیانی کوڕەکەی دەدات، دەربارەی هاوسەریش هەمان یاسا لە ئارادایە.

**دکتورە (فایزە یوسف) راگری کۆلیژی (طفولة) لە زانکۆی (عین شمس):**

دەڵێت: بێگومان هۆکاری جیاوازی و گرفتی نێوان ئافرەت و خەسوی بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە.

١. ڕۆڵی ڕاگەیاندن کە هەمیشە وێنەی خەسوو بە شێوەیەکی نا واقعی نیشان دەدات بە مەبەستی (کۆمیدیا) و پێکەنین، ئەم وێناکردنەش کاریگەری لەسەر دەرونی بینەرانی دروست دەکات و سەرەنجام دەبێتە هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایەتی و ئافرەت کاتێ شوو دەکات لە لوتکەی ترسدایە لە خەسووی، دایکیش هەمیشە لەمەڵاسدایە بۆ خەسووی کچەکەی تا پارێزگاری لە کچەکەی بکات و لە شەڕی خەسوی بیپارێزێ.

٢. جاری وا هەیە سروشتی دەرونی دایك کە لە ژیانی خۆیدا شکستی هێناوە بەهۆی خەسوی، بۆیە ترسی ئەوەی هەیە کە کچەکەشی بە هەمان ئەزمونی تاڵدا بڕوات، بۆیە وێناکردنێکی خەیاڵی بۆ خەسوو دەکێشێ لە ئەندێشەی کچەکەیدا، ئەویش وا دەکات کچەکەی هەمیشە ئامادەی جەنگ بێت لە نێوان خۆی و خەسویدا.

٣. نەبونی نەرم و نیانی و لێبوردن لەلای هەردوو بەرامبەر، بۆیە هەرچەند ئەوان هەوڵی پڕ کردنەوەی گرفتەکانی نێوانیان بن، هەر زیاتر دەبێت و قوڵتر دەبنەوە.

٤. جاری وایە هۆکارەکە سیفاتێکی کەسێتی ئەو ئافرەتەیان خەسوەکەیەتی، هەر یەکێك لەوان دەیانەوێت ئەو کەسە تەنها بۆ ئەوان بێت، بەڕاستی ئەگەر هەردوکیان (خۆپەرستیٚ) وەلا بنێن، گرفتەکان چارەسەر دەبن.

## دکتور (إسماعیل ئەلفەقیٚ) دەڵێت:

هۆکاری بنەڕەتی، تێنەگەیشتنی خێزانە بەرامبەر کوڕ، چونکە کوڕ رۆژێك هەر دەبێت کە ببێتە کەسێکی سەربەخۆ و تایبەت، ئەویش ئەو کاتەیە کە ژن دەهێنیٚ و ئەرك و لێپرساوی زۆر دەبێت و وای لێدەکات، کە دور بکەوێتەوە لە دایك و باوك، جا تێنەگەیشتنی خێزان بۆ ئەو راستییە ، وایان لێدەکات کە هەست بکەن کوڕەکەیان کەمتەرخەمە بەرامبەریان و کوڕەکەی جاران نەماوە، بەڵکو بۆتە کەسێکی تر و گۆڕاوە.

هەروەها هۆکارێکی تر ئەوەیە، جیاوازی ئاستی رۆشنبیری دوو نەوە، نەوەی رابردوو کە خۆی لە خەسوو خەزوور دەبینێتەوە لەگەڵ نەوەی ئێستا کە کوڕ و هاوسەرەکەیەتی، لە نێوان ئەم دوانەدا جیاوازی زۆر هەیە لە رووی رۆشنبیری و شێوازی ژیان و بیرکردنەوە، جا کەواتە چۆن دەتوانن ئەم دوو نەوەیە بەرامبەر یەکتر حاڵی بکەین و لێکیان نزیك بکەینەوە؟ لێرەوە پێویستە ئافرەتی رۆشنبیر، زیرەکانە رۆشنبیری خۆی بەکار بهێنێ تا بتوانێ ئەم ململانێیە بگۆڕێ بە گفتوگۆیەکی بەردەوام لە نێوانیاندا.

**دووەم:**

## دیاردە و شوێنەوارەکانی ئەم جیاوازییە

لە دیاردەکانی ئەم گرفتە لە نێوان هاوسەر و خەسودا ئەوەیە کە رۆژانە هەستی پێدەکەین و بە ئاشکرا قسەی برینداركەر و كرداری نەشیاو لە هەردوولا بەدی دەكرێت، دایك بە چاوێكی نەشیاو و تورە سەیری بوكەكەی دەكات چونكە بۆتە مایەی دورخستنەوەی كورەكەی، ئەگەر ژنی كورەكەی بیەوێت روانگەی خۆی لە ئامۆژگاری و دڵسۆزی رۆشن بكاتەوە، هەموو دنیا دێنێتە سەرسەما و هێواش نابێتەوە و تورە دەبێت، دەنگی بەرزدەكاتەوە و چاوی سور هەڵدەگەرێت و هاوسەنگی خۆی لەدەست دەدات و سەرەنجام زوبانی كۆمەڵێ وشەی ئازاردەر دەردەبرێت زۆر جاریش بە دەست دەكەوێتە ئازاردان،

ئەگەر كەسێكیش بەهاواریانەوە بێت، دەست دەكات بە سكاڵا لەدەست هاوسەری كورەكەی كە گوایە بێئەدەبی نواندووە وە دەڵێ: ئافرەتانی ئەمرۆ نایانەوێت دایك لەگەڵ كورەكانیدا پارووە نانێك بخوات.

(جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە ئەم هەڵوێست و قسە نەشیاو کردارە نەخوازراوانە لە لایەن (بوکەوە) رودەدات، ستەم لە خەسووی دەکات و زۆر جار بە قسەی ناشرین دڵی دایکی مێردەکەی بریندار دەکات و لای هاوسەرەکەی لە پاشەملە قسەی بۆ دەکات و هەوڵ دەدات گرفت لە نێوان کوڕ و دایك دروست بکات و زۆرجار بۆ ئەو مەبەسە قسەی ناڕاست و بوختانی زۆر هەڵدەبەستیٚ، لەبەرچاوی مێردی خۆی دەکات بە فریشتە و لە کاتی دیارنەمانی مێردەکەشی بە قسەی ئازاربەخش بەردەبێتە گیانی خەسووی) .[1]

## شوێنەوارەکانی ئەم گرفتانەش

١ . ئازاری دەروونی: ئەمەش سەرەنجامی تێك چونی کۆئەندامی مێشك و تێکچونی کاری ئەندامەکانی لاشە، چونکە سەلمێنراوە بێتاقەتی و خەم و دڵەڕاوکیٚ و نائومێدی کاریگەری خراپیان لەسەر ئەندامەکانی لاشە هەیە خوای گەورە راستی فەرمووە کە دەربارەی (یعقوب) سەلامی خوای لیٚ بێت کاتیٚ

---

[1] وەرگێڕ

خەمباری (یوسف) دەبێت دەفەرموێ ﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ﴾ یوسف: ٨٤.

٢. مراندنی توانا ئیجابیەکان بەهۆی مراندنی ویستی ئازادی مرۆڤەکان، ئیتر ئەو فرسەتە لەدەست دەچێت کە سود لە تواناکانی ئافرەت وەربگرێ.

٣. توش بوونی ژن بە نەخۆشی دوودڵی لە زۆربەی کارەکانیدا، چونکە رێگەی پێنەدراوە کە بڕیار بدات و ئەوەی لە دەرونیدایە دەری ببڕێت.

٤. لەدەستدانی جیهانبینیەکی راست و دروست بۆ ژیان، بەهۆی ئەم لێکترازان و پەشێویەی کە تێکەیشتنە هەڵەکانە بۆی دروست کردووە.

٥. دواکەوتنی لە تەمەنی پێك هێنانی خێزان، هەرکەس دێتە داوای، قبوڵی ناکات و هەر چاوەڕێی کەسێکە بەبێ دایك لە ترسی توشبونی بە گرفت.

٦. زۆرجار سەردەکێشێ بۆ جیابونەوە (تەڵاق) ئەمەش سەرەنجامێکی ترسناکی هەیە و مایەی پەرتەوازە بوونی خێزان و دارمانی ئەو ماڵەیە.

٧. لەدەستدانی ماڵ و سامان و تەمەن لە هاتوچۆی دادگا، یان زنجیرە جیاوازییەك كە كۆتایی نایەت، یان ناچاركردنی پیاو كە دەبێت یان ژنەكەی هەڵبژێرێت یان دایكی.

٨. ماندوبونی مێشكی ژن یان پیاو، كە ئەویش سەردەكێشێ بۆ دروستبوونی نەوەیەكی لاواز و نا ئارام، كە دینیان و ئیمانیان لاواز دەبێت و جاری واش هەیە هەر لایەك دەكەونە فێڵكردن لە بەرامبەرەكەی.

٩. ناچاربوون بە خانەی پیران، ئەگەر دایكەكە حەز بە گرفت نەكات، ناچار ئەو ماڵە بەجێ بهێڵێ و رووبكاتە خانە و لانەی پیر و پەككەوتەكان.

١٠. توشبونی منداڵەكان، ئەوان لە خێزانی پڕ لە كێشە و گرفتدا گەورە دەبن، خێزانێك پڕ لە نەخۆشی و پەرتەوازەیی دەرونیە، ئەو منداڵە توشی ترسێكی هەمیشەیی، یان هەمیشە هەست بە ئازاری سك دەكات، یان میزكردن بە خۆدا بە بێ ویستی خۆی، یان خواردنی نینۆك یان منالەكە كەسێكی شەڕەنگێزی لێدەردەچێت، هەرچی لەدەرەوەی بێت پەلاماری دەدات و دەیشكێنێ و بەمەش ئەوەی لە دەرونیدایە دەریدەبڕێت[1].

[1] بڕوانە پەراوی (آه من الحموات) – ص٢٤-٢٨.

**سێیەم:**

## چارەسەری جیاوازیی نێوان هاوسەر و خەسوو:

هەموو کەسێك لە ئەندامانی خێزان بەرپرسن لە ئارامی خێزان، بۆ چارەسەری ئەم گرفتەش پێویستمان بە هەمووان هەیە، (مێرد) و (هاوسەرەکەی)، (دایکی مێرد ـ خەسوو) (دایکی ئافرەت ـخەسووی پیاو) هەرچەندە وەك شوێن دورە، بەڵام نزیکی لە کچەکەی کاریگەری گەورەی هەیە، لە بیرمان نەچێت کە باوکی هەریەك لە مێرد و ژن هەردووکیان ئەرکیان لەسەرشانە و دەتوانن کاراکتەرێکی باش بن بۆ ئارامی ئەو خانەوادەیە.

## یەکەم: رۆڵی مێرد لە چارەسەری گرفتەکان:

جاری وا هەیە پیاو ناتوانێ هاوسەنگی نێوان خێزان و دایك و باوکی رابگرێ، چونکە توشی ئەو گرفتە دەبێت کە کێشەیە لە نێوان باوك و دایکی و لە نێوان هاوسەرەکەیدا، جاری واش هەیە هاوسەر ترسی خوای لە دڵدا کەمە، دەیەوێت گرفت بۆ هاوسەری دروست بکات، یان دەگونجێ دایکی و باوکی سروشتێکی توندیان هەبێت و لەکەس رازی

نین، رەنگە زۆریش لە کوڕەکەیان بکەن بۆ تەڵاقدانی ژنەکەی لە کاتێکدا هیچ کارێکی نەکردووە کە شایستەی ئەو سزایە بێت، رەنگە تەنها لەبەر ئەوە بێت کە خێزانەکەی کاریگەری لەسەر کوڕەکەیان هەیە و بە ویستی خۆی هەڵسو و کەوت دەکات، لە راستیشدا وا نییە، بەڵکو مێردەکەی مافی بە هاوسەرەکەی داوە، یان رەنگە کەمێك کەمتەرخەم بێت، ئایا لەم کاتانەدا چارەسەر چییە؟ ئایا گونجاوە مرۆڤ دەستەوسان راوەستێ و هەنگاوێك نەنێت؟ ئایا شیاوە ئازاری دایك و باوکی بدات و خراپەیان بەرامبەر بکات و بەتوندی بەرپەرچیان بداتەوە بۆ رازی کردنی هاوسەرەکەی؟

یان دەگونجێت لەگەڵ باوك و دایکیدا بێت لە هەموو قسەکانیدا بەرامبەر هاوسەرەکەی و بەراستیان بزانێت؟ هەمیشە هاوسەرەکەی تاوانبار بکات و هەموو مافێك بە دایك و باوکی بدات و لێگەڕێ باوك و دایکی توشی هەڵەی بکەن؟ نەخێر . . .

کارەکە بەم شێوە نابێت بەڵکو پێویستە هەموو توانای [illegible]ی بخاتەکار بۆ چاکسازی و ئاشتەوایی لە نێوانیاندا و کێشەکان بەرەو چارەسەر ببات .

بەڕاستی کەسایەتی مرۆڤ لەو کاتەدا دەردەکەوێت کە بتوانێ هاوسەنگی لە نێوان ئەرك و پێداویستیەکاندا رابگرێت کە لە نێوان خەڵك روبەڕو دەبنەوە.

زۆرجار ئەو کارە مرۆڤ دەخاتە دودڵی و گومان و راڕایی.

لێرەدا ئازایی و کەسایەتی مرۆڤ بەدیار دەکەوێت کە مافی هەموان بدات، بەبێ ئەوەی ستەم لەلایەنی بەرامبەری بکات، گەورەیی پەیامی ئیسلامیش لەوەدایە کە کۆمەڵێ یاسا و رێسای هێناوە کە کاراکتەرەکان بە هاوسەنگی دەپارێزێ، مرۆڤی ژیر و بڕیاردەر بەیارمەتی خوا دەتوانێ مافەکان بدات بە خاوەنی مافەکان.

بە دڵنیایەوە زۆرێك لە ناهەمواریيە کۆمەڵایەتیەکان و گرفتە خێزانیەکان بەهۆی نەمانی ئەو هاوسەنگیە رودەدات، ئەوەش کە هاوکاری چارەسەرکردنی دەکات ئەوەیە کە هەریەك لە ئاستی خۆی ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکات و مافەکانی وەربگرێ لێرەدا چەند ئاراستەیەك دەستنیشان دەکەین بۆ هەریەك لە کوڕی (مێرد) و هاوسەر و دایك و باوکی بەتایبەت دایك.

**ڕۆڵی کوڕ (مێرد):**

بۆ ئەوەی بتوانێت هاوسەنگی دروست بکات لە نێوان باوك و دایکی و هاوسەرەکەی ئەم خاڵانەیە:

**أ.چاودێری کردنی دایك و باوکی و خزمەت کردنیان و موراعاتی سروشتیان:**

ئەمەش بەوە دەبێت کە دەرگای چاکەکردنیان لەسەر دانەخات دوای ئەوەی ژن دەهێنیٚ وە زیاد لە پێویست خۆشەویستی بۆ هاوسەرەکەی بە ئامادەبونی دایك و باوکی دەرنەبڕێت، بەتایبەت ئەگەر یەکێك لەوان سروشتی توندی هەبوو، چونکە بەو کارە هەستیان دەبزوێنیٚ و دەرونیان پڕ کینە دەکات و توشی (غیرە) دەبن بە تایبەت دایك، وە پێویستە هەوڵ بدات خۆ بگونجێنیٚ لەگەڵیاندا و ڕازییان بکات و دڵیان ڕابکێشیٚ.

**ب. بە ویژدانی بوون لەگەڵ هاوسەرەکەیدا:**

ئەویش بەوە دەبێت کە مافەکانی بپارێزیٚ و هەرچی لە باوك و دایکییەوە دەبیستیٚ قبوڵی نەکات، بەڵکو پێویستە لەسەری گومانی چاکی هەبێت و لێکۆڵینەوە لە قسەکان بکات.

**ج. دروستکردنی سۆز و خۆشەویستیە :**

بۆ نمونە ئامۆژگاری هاوسەرەکەی بکات کە دیارییەك بۆ باوك و دایکی ببات، یان خۆی بیکرێت، بەڵام لە ڕێگەی هاوسەری پێشەکەشیان بکات، بە تایبەتی دایك، ئەمەش دڵەکان نەرم دەکات و کینە لادەبات و خۆشەویستی دروست دەکات و گومانی خراپ دەرەوێنێتەوە.

**د. گفتوگۆ و تێگەیاندنی هاوسەر:**

بۆ نمونە پێی بڵێت: دایك و باوکم بەشێکی دانەبڕاون لە من، هەرگیز خراپەیان لەگەڵ ناکەم، وە قبوڵی ئازاردانیان ناکەم، ئەگەر تۆش دڵسۆزیان بیت خۆشەویستیت لە لام زیاد دەکات، وە بیری بخاتەوە کە ڕۆژێك دەبێت ئەویش دەبێتە دایك، ڕەنگە بە هەمان بار و زروفدا تێپەڕ ببیت، جا ئەو کاتە پێی خۆشە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئاوا مامەڵە لەگەڵ دایك و باوکم بکە، وە دڵنیای بکاتەوە کە دەمەدەمێ تەنها قوڵ کردنەوەی کێشەی بەدوادا دێت، نەرم و نیانی لە هەر شتێکدا بێت جوانی دەکات و لە هەر شتێکیش نەبێت ناشرین دەبێت.[1]

---

[1] بڕوانە (من اخطاء الازواج) محمد ابراهيم الحمد – ص٩٠٥.

## ٢. گفتوگۆی نەرم و نیان لەگەڵ دایك :

پێویستە پیاو (مێرد) لە دوری هاوسەرەکەی ئامۆژگاری دایکی بکات و بە نەرمی لەگەڵیدا بدوێت و بیری بخاتەوە کە هاوسەرەکەی مافی هەیە کە خوا بۆی داناوە، دایکیشی رازی نابێت کە کوڕەکەی بچێتە ئاگرەوە بەهۆی کەمتەرخەمی نواندن لەبەرامبەر مافەکانی و ستەم لێکردنی هاوسەرەکەی، دەبێت دایکی تێبگەیەنێت کە خوای گەورە فەرمانی هەڵس و کەوت و نەرم و نیانی و رێزگرتنی هاوسەرەکەی داوە بەسەریدا.

بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی :

(**ولزوجك عليك حقا**) الصحيح الابخاري٦١٣٤.

### ٣. پێش بڕیاردان لە کارەکان دڵنیابە

پێویستە هاوسەر هەر لایەنێك قسەی بۆ بکات بە وردی لێی بڕوانێت، خۆشەویستی بۆ دایکی یان سۆزی بەرامبەر هاوسەری نابێت ڕێگەی ئەو کارەی لێ بگرێت، چونکە هەر لایەك لەو دوو لایەنە جاری وا هەیە لە قسەکانیاندا زیادەڕەوی هەیە، بۆیە چەندین ماڵ و خێزان تێکچوون بەهۆی بڕیاری خێرای پیاو، سەرەنجام بە چەند قسەیەکی هەڵبەستراو هاوسەرەکەی تەڵاقداوە لە کاتێکدا بێ گوناە بووە.

### ٤. هەمیشە فەرمانەکانی خوا بیر هاوسەرەکەت بخەرەوە.

بیری بخاتەوە کە خوا فەرمانی چاکەکردنی بەرامبەر باوك و دایك کردووە و فەرموویەتی

﴿وَٱعۡبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُوا۟ بِهِۦ شَيۡـࣰٔاۖ وَبِٱلۡوَ ٰلِدَيۡنِ إِحۡسَـٰنࣰا﴾

النساء: ٣٦.

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوۤا۟ إِلَّاۤ إِیَّاهُ وَبِٱلۡوَ ٰلِدَیۡنِ إِحۡسَـٰنًاۚ﴾

الأسراء ٢٣ .

﴿أَنِ ٱشۡكُرۡ لِی وَلِوَ ٰلِدَیۡكَ إِلَیَّ ٱلۡمَصِیرُ﴾ لقمان: ١٤.

جا ئەگەر قورئان فەرمانی چاکەی لەگەڵ دایك و باوك بە گشتی کردووە، ئەوا راستەوخۆ ئاماژەی بە نارەحەتییەکانی دایك کردووە و فەرموویەتی:

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ﴾ لقمان: ١٢.

لە شوێنی تردا فەرموویەتی:

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَـٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهْرًا﴾ الاحقاف: ١٥.

لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خواﷺ سێ جار فەمانی چاکەی کردووە لەگەڵ دایك و پاشان جارێك بەرامبەر باوك، کاتێ پرسیاری لێدەکەن: چ کەسێك لە پێشترە بۆ چاکەکردن لەگەڵیدا؟ فەرمووی: دایکت، وترا: پاشان کێ؟ فەرمووی: دایکت. وترا: پاشان کێ: فەرمووی دایکت.

وتی: پاشان کێ: فەرمووی: باوکت.[1]

---

[1] متفق علیه (٥٩٧) مسلم ٢٥٤٨.

هەروەها فەرموویەتی: خـوا فـەرمانتان پێـدەکات بـە چـاکەکردن لەگەڵ دایکتان، پاشان فەرمانتان پێدەکات بـە چـاکەکردن لەگـەڵ دایك، پاشان فەرمانتان پێدەکات بە چاکەکردن لەگـەڵ دایکتـان، پاشان فەرمانتان پێدەکات بە چاکە کردن لەگـەڵ باوکتـان، ئینجـا نزیکتر و نزیکتر[1].

لەم فەرمودەیەوە هەندێك لە زانایانی موسڵمان دەڵێن: سێ لە چواری چاکە بۆ دایکە، یەك لە چواریش بۆ باوك، چونکە دایك زیاتر ئازاری چەشتووە لە باوك، دایك زیاتر پێویستی بە چاکە و چاودێری منداڵەکانی هەیە، باوك بەتواناترە و خاوەنی داراییە، هەروەها زۆرجار منداڵ لە بەردەم دایکدا بەجورئەترە و دەتوانێت خراپەی لەگەڵ بکات.[2]

بۆیە پێویستە مێرد بیری خۆی و هاوسەرەکەی بخاتەوە کە سوپاسگوزاری بەرامبەر دایك سنوری نیە، ئەوەتا پیاوێك دێتە لای پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب ﷺ و دەڵێت: دایکم پیر

[1] صحيح ابن ماجة (٢٠٦٩).

[2] الاسرة كما يريدها الانسان – د.يوسف القرضاوي – ص٥٤.

بووه و کەوتۆتە تەمەنەوە، ناچار دەبم بەکۆڵ هەڵی بگرم و دەستنوێژی پێبکرم، ئایا مافی دایکم داوە؟

عومەر ﷺ فەرمووی: هەرگیز مافت نەداوە، چونکە ئەو کاتێك خزمەتی تۆی دەکرد هیوای ژیان و مانەوەی تۆی بوو، بەڵام تۆ کە خزمەتی دەکەیت، هیوای مردنی بۆ دەخوازیت.

جوانترین نمونە بۆ چاکە لەگەڵ دایك ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەرە ﷺ کاتێك حەلیمە سەعدیە ﷺ (کە دایکی شیری پێغەمبەرە ﷺ) دێت بۆلای، زۆر بە گەرمی پێشوازی لێدەکات و ڕێزی لێدەگرێت و، هاوەڵانیش هەمان ڕێز و پێشوازی لێدەکەن.

دەگێڕنەوە کە دێت بۆلای پێغەمبەر ﷺ عەباکەی خۆی ڕادەخات تا لەسەری دابنیشێت و دەفەرموێت: "سڵاو لە دایکم" پاشان پێی دەفەرموێت: "تکا بۆ کێ دەکەیت تکاکەت وەرگیراوە. . . داوای چی دەکەیت پێت بەخشراوە".

ئەویش دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەستە، هاتوم تکایان بۆ بکەم.

فەرمووی: ئەوەی مافی من و مافی بەنی هاشم بێت هی تۆیە.

خەڵك لە هەموو لاوە هەستان و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچی مافی ئێمەشە بۆ ئەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بردی و کەنیزەکێکی پێبەخشی تا خزمەتی بکات و بەشەکەی خۆشی لە غەزای حونەین بەخشی بە دایکی.

بەم شێوەیە لە هەموو سەردەمێکدا موسڵمانان چاویان لە پێغەمبەرەکەیان کردووە، تا پەڕاوەکانی مێژوو پڕ بوون لەو چیرۆك و روداوانەی کە باس لە چاکەکردنی منداڵ دەکەن لەگەڵ دایك و باوکیان. مەئمون دەڵێت: کەسم نەدیوە وەك فەضلی کوڕی یەحیا چاکەکار بێت لەگەڵ دایك وباوکی، ئەوەندە چاکەکار بووە کە هەمیشە بە ئاوی گەرم دەسنوێژی بۆ دایکی گرتووە، شەوێکی سارد سوتەمەنییان نامێنێت، کاتێك دایکی دەچێتە سەر جێگای خەوتن، ئەو هەڵدەستێت و قاپێکی مس دەهێنێت و پڕی دەکات لە ئاو، پاشان لە چراکە نزیکی دەکاتەوە، بەم شێوەیە دەوەستێت تا بەیانی کە دایکی هەڵدەستێت لەخەو، دەبینێت ئاوەکە گەرمە!!.

هەموو ئەمانە ناتوانین بەرابەری بکەین بە مافی دایك، چونکە ئەو بە پێستی سکی ئەو منداڵەی هەڵگرتووە، خوێنی خۆی پێ

بەخشیوە، کاتێکیش لەدایك بووە شیری خۆی پێداوە و ژیاندویەتی، پاشان ژیانی تەرخان کردووە بۆ ئەو، ئەگەر منداڵەکە زەردەخەنەی کردبێت، دایکەکە وایزانیوە هەموو دنیا لە ڕێگەی لێوەکانی منداڵەکەی پێدەکەنێت... خۆ ئەگەر گریابێت دنیای لەبەرچاو تاریك بووە... خۆی بێبەش کردووە تا بە منداڵەکەی ببەخشێت... سکی خۆی برسی کردووە تا ئەو تێر بێت... خۆی پۆشتە نەکردووە تا منداڵەکەی پۆشتە بێت...

چین بە چین پەروەردەی کردووە، تەمەنی منداڵەکەی زیادی کردووە و تەمەنی دایك کەم بۆتەوە، ئەوی بەرەو گەنجی بردووە و خۆی لە پیری نزیك خستۆتەوە.[1]

ئەمانە و چەندین نمونەی تر کە کوڕ بیری خۆی بخاتەوە لەسەرەتادا، پاشان بیری هاوسەرەکەی، تا ببێتە هۆکاری یارمەتیدان لەسەر چاکەکردن لەگەڵیان.

---

[1] الدين القيم – د.عبدالرحمن رافت باشا – ص١٠١.

**بڕوانە بۆ ئەم پەیامە کە پوختەی ئەوانەیە باسمان کردووە:**

ئەی مێرد... ببە بە کەسێکی ژیر و دانا، بەژیریت کارەکانت بکێشە، زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ دایك و هاوسەرت بکە، مافی دایکت ئاشکرایە و هەرگیز دایکت بۆ دروست نابێتەوە، بۆیە تا لە ژیاندایە چاکەکاربە لەگەڵیدا و هەوڵی رەزامەندی بدە، هەروەها ستەم لە هاوسەرەکەت مەکە، بە نەرم و نیانی مامەڵەی لەگەڵدا بکە، بەسۆزبە، خۆشت بوێت و هەمیشە یادی بخەرەوە کە دایکت دایکی ئەویشە و خۆشت دەوێت و دایکت خۆشحاڵە بە ژیان لەگەڵ ئێوە.

وریا بە... لەسەر حسابی دایکت گوێڕایەڵی هاوسەرەکەت مەکە، هەروەها هاوسەنگی لە نێوان مامەڵەی هاوسەرت و مامەڵەی دایکت رابگرە، هاوکاری هاوسەرەکەت بکە بۆ خزمەت کردنی دایکت، چونکە لە سەرەتا و کۆتاییدا هەر دایکتە، بۆیە مەهێڵە گرفتە بچوکەکان لە نێوان دایکت و هاوسەرت گەورە ببن.

بۆ ئەوەی راستگۆ بم لەگەڵتا دەڵێم: هەرچەندە ماوەی نێوان هاوسەرت و دایکت نزیك بێت، ژیانت خۆشتر و بەختەوەرتر دەبیت.

بەڵام ئەگەر گرفت زۆربوو، بە شێوازێکی جوان و پڕ لە ئەدەب داوا لە دایکت بکە کە چاوپۆشی بکات و لەگەڵ هاوسەرەکەت گرفت دروست نەکات، بەجوانیش داوا لە هاوسەرەکەت بکە تا رێزی دایکت بگرێت، چونکە دایکت گەورەترین و بەنرخترین شتە لەدەستی تۆدا.

راستەوخۆ پێی بڵێ کە تۆ هەموو مافەکانی هاوسەرت دەدەیت و خۆشت دەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرامبەر مافی دایکت کەمتەرخەم مەبە. [١]

---

[1] http://www.wadawh.com

**دووەم: رۆڵی هاوسەر لە چارەسەری گرفتەکاندا:**

بەڕاستی (ژن) رۆڵی گەورەی هەیە لە چارەسەری کێشەکاندا کە لە نێوان خۆی و خەسویدا روودەدات، بەڵکو ئەو کارەکتەرێکی بنەڕەتیە لەو جیاوازییەدا.

بۆیە بەو ئافرەتە بەرێزانە دەڵێین: بێگومان چاکەکاری تۆ لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەت (خەسوت) نزیکترین رێگەیە بۆ چوونە ناو دڵی مێردەکەت، ئەگەر تۆ رێزی دایکیت گرت و چاکەت لەگەڵ کرد، ئەوکاتە هاوسەرت تۆی خۆش دەوێت و سوپاسی کردەوە جوانەکانت دەکات، کەواتە بۆچی سکاڵا دەکەیت لەدەست دایکی وتەحەمولی ناکەیت؟!.

بۆچی کەم و کوڕی دایکی لای هاوسەرت باس دەکەیت، کاتێك دەزانیت ئەوە دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشە لە نێوانتاندا؟!.

ئەی هاوسەری بەڕێز... بەراستی چاکەکردنت لەگەڵ دایکی مێردەکەت بەڵگەی جوانی رەوشت و هێز و ورە بەرزی تۆیە، تۆ رۆڵی گەورەت لەم بوارەدا هەیە، دەتوانیت رێزی

مێردەکەت بگریت و لیّ ی نزیك ببتەوە و زیاتر ریّزی دایك و باوکی بگریت، ئەوە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی هاوسەرداریتان و بڵێسەی ئاگری ئاشوب لە نێوانتاندا خامۆش دەکات، ئەگەر مێرد لەروانگەی شەرعەوە داوای راگرتن و پاراستنی مافی دایك و باوکی لێکرابێت و ئەو نزیکیە بپارێزێت، بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە ئوممەتی ئیسلامدا، ئەوا بەهەمان شێوەش ئافرەت لەڕوانگەی شەرعەوە داوای لێکراوە کە پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ مێردەکەی بپارێزێت بۆ راگرتن و بەهێزکردنی پەیوەندی هاوسەری.

پاشان رێزگرتنی ئافرەت لە دایك و باوکی مێردەکەی کە هاوتەمەنی (دایك و باوکی ئافرەتەکەن) رەوشتێکی رەسەنی ئیسلامییە، بەڵگەی بەرزیی دەرون و رەوشتە، با تەنهاش مەبەستی رازیکردنی دڵی هاوسەرەکەی بێت، یان بۆ راکێشانی سەرنج و خۆشەویستی خزمەکانی بێت.

هەروەها پێویستە ئافرەتی بەرێز بزانێت کە ئەو ئافرەتەی وادەزانیت کێبڕکێت لەگەڵ دەکات ئەوە دایکی مێردەکەتە، ئەو

کوڕەش ناتوانێت وازی لێبهێنێت، چونکە دایکێتی کە (نۆ) مانگ بەسکی هەڵیگرتووە و بەشیری خۆی گۆشی کردووە و بەسۆز و میهرەبان بووە و ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردووە تا کردویەتی بەو پیاوەی کە ئێستا هاوسەری تۆیە.

ئینجا ئەو ئافرەتە نەنکی منداڵەکانی تۆیە و پەیوەندی بەهێزی لەگەڵیاندا هەیە، بۆیە جوان نییە کە وەك دوژمنێك مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، چونکە ئەوکاتە ئەویش بە هەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵدا دەکات.

جاری واش هەیە هەندێك هەڵوێستی سارد لە دایکیەوە دەبینیت، بەڵام دەبێت ئارام بگریت و چاوەڕێی پاداشت بیت، ئەگەر لەناو ماڵ و خێزاندا رەوشتی ئیسلامی بڵاوبۆوە و هەرکەسێك ماف و ئەرکی خۆی بزانێ، ئەو خێزانە رەزامەند و بەختەوەر دەبن.

جا هاوسەری بەڕێز بزانە کە مێردەکەت کەسوکاری خۆی خۆشتر دەوێت لە کەسوکاری تۆ، تۆش لەم بارەوە سەرزەنشتی مەکە، چونکە تۆش بەهەمان شێوەیت، بۆیە

ئاگاداربە و هەوڵمەدە کەسوکاری لەلا ناشرین بکەیت، یان وابکەیت کەمتەرخەمبێت بەرامیەریان، چونکە ئەوە گرفت لەنێوانتاندا دروست دەکات. . .

کەمتەرخەمی ژن لە رێزگرتنی کەسوکاری مێردەکەی، کەمتەرخەمیە بەرامبەر بە رێزی خودی مێردەکەی.

پاشان دەزانیت ئەو پیاوەی کەسوکاری خۆی خۆشدەوێت و لەگەڵ دایك و باوکی بەڕێزە، ئەو کەسە کەسێکی رێزدار و چاکە و شایستەی ئەوەیە هاوسەرەکەشی رێزی بگرێت و خۆشی بوێت و ئومێدی خێر و چاکەی پێ هەبێت.

ئەو پیاوەش کە هیچ خێری بۆ دایك و باوکی نیە، زۆرجار خێری بۆ هاوسەر و منداڵەکانیشی نابێت.

ئەگەر تۆ رازی بیت کە مێردەکەت ئازاری دایك و باوکی بدات و خراپەکاربێت لەگەڵیان، یان رازی بێت تۆ مامەڵەی خراپ لەگەڵ دایك و باوکی بکەیت، ئایا رازیت کە ئەویش هەمان مامەڵە لەگەڵ دایکی تۆدا بکات؟ یان

هاوسەری براکانت بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ دایکی تۆدا بکەن؟ .

ئایا رازیت بەو شێوە هاوسەری کوڕەکانت بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵدا بکەن، کاتێك کوڕەکانت بونە خاوەنی هاوسەری خۆیان؟ ئەو کاتەی لاشەت لاواز و سەرت سپی بوو؟

لەکۆتایدا: هەڵوێستی ئافرەتی چاك کە یارمەتی هاوسەرەکەی دەدات بۆ چاکەکردن ـبەیارمەتی خواـ زەمانەتی چارەسەرکردنی کێشەکانە، ئەوە دڵەکان پێکەوە وابەستە دەکات، چونکە دایك و باوك ئەگەر خۆشەویستیەکی راستەقینەیان بینی لەلایەن هاوسەری کوڕەکەیانەوە ئەوانیش ئەو هەڵوێستە دەنرخێنن.

زۆرجاریش بینراوە کە زۆرێك لە دایك و باوك هاوسەری کوڕەکەیان بە ئەندازەی کچی خۆیان خۆش ویستووە، ئەمەش بە یارمەتی خوا و ئاکاری جوانی ئەو ئافرەتانە بووە کە هەمیشە سوور بوون لەسەر مامەڵەی جوان لەگەڵ دایك و باوکی مێردەکانیان.

زیادله‌مانه‌ش شتێکی تر یارمه‌تی ئه‌وه ده‌دات که ئافره‌ت جێی خۆی له دڵی باوك و دایکی مێرده‌که‌یدا بکاته‌وه، ئه‌ویش ئارامگرتنه له‌سه‌ر سارد و سڕی ئه‌وان، چاکه‌کردن و چاوه‌ڕێی پاداشتی خوایی، ئه‌ویش به‌وه ده‌بێت که دیارییان پێشکه‌ش بکات، به‌جوانی قسه‌یان له‌گه‌ڵدا بکات، گوێ بۆ قسه‌کانیان بگرێت و نه‌رمونیان بێت، سڵاویان لێبکات، ئامۆژگاری مێرده‌که‌ی بکات که مافی دایك و باوکی بپارێزێت.

ده‌ستی نزا و پاڕانه‌وه بۆلای خوا به‌رز بکاته‌وه، داوابکات خوا دڵیان بکاته‌وه و سۆزیان بجوڵێنێت و یارمه‌تی ئه‌میش بدات به‌جوانی مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵدا بکات.

ئه‌ی هاوسه‌ری به‌ڕێز... ئه‌م واتا جوانانه بهێنه پێش چاوی خۆت، بیری ئه‌وه بکه‌ره‌وه که به چاك باست ده‌کرێت و خواش پاداشتی گه‌وره‌ی له دواڕۆژدا بۆ ئاماده کردویت.[1]

هه‌روه‌ها پێویسته له‌سه‌ر ئافره‌ت هه‌وڵبدات گفتوگۆ له‌گه‌ڵ دایکی مێرده‌که‌ی بکات، تا ئه‌ویش هه‌ست بکات که

---

[1] اخطاء الزوجات – محمد بن ابراهيم – ص١١-١٦.

رۆڵ و کاریگەری ماوە، و بیری بەسود و تێڕوانینی دروست بۆخۆی دروست بکات و عوزر بهێنێتەوە و بڵێت: خەسوم لەو قسەدا مەبەستی سوکایەتی کردن نەبوو بە من، یان رەنگە بێتاقەت بێت و بەهانەیەکەی هەبێت، یان قەیناکە ئەویش لەجێی دایکمە، یان بە بیروبۆچونی خۆی مەبەستی یارمەتیدانی منە، یان رەنگە کاتێکی زیاترم بوێت بۆ تێگەیاندنی بە شێوازێکی راست و دروست. . . .

## هەندێك ئامۆژگاری بۆ چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ خەسودا:

### ١.وەك دایك مامەڵەی لەگەڵدا بكە:

هەر لە سەرەتای رۆژی یەكەمی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، هەریەك لە بوك و خەسوو چاوەڕێی بەرپابوونی جەنگێكی نوێ دەكەن و هەریەك لەوان دەیەوێت تیایدا سەربكەوێت، لەگەڵ ئەوەی دۆڕاو لە كۆتاییدا (پیاو ـ مێرد) دەبێت.

بەڵام ئافرەتی ژیر ئەوەیە كە هەوڵبدات وا لەخەسوی بكات ببێتە دایك، تا وەك دایكێك ئارام بگرێت لە ئازاری منداڵەكانی، جا ئەگەر دەتەوێت دڵی خەسووت بۆلای خۆت رابكێشیت وەك دایك مامەڵەی لەگەڵدا بكە، ئەوكاتە دەبینیت ئەو دوژمنە نیە كە چاوەڕێت دەكرد، بەڵكو زیاتر تێدەگات و هەوڵی بەدیهێنانی ژیانت دەدات.

ئەم هەنگاوەش زۆری تێناچێت،بەڵام زوو بەرهەمەكەی دەبینیت.

**٢.هەمیشە پێی بڵێ: بەڵێ.**

کاتێك خەسوت هەست دەکات گوێی بۆ دەگریت و گرنگی بە قسە و بۆچونەکانی دەدەیت هەست بە ڕەزامەندی دەکات، هەرچەندە زۆر ئافرەت هەن کە رازی نابن خەسووەکانیان دەست بخەنە ژیانیان، بەتایبەتی لە پەروەردەی منداڵدا تەنها وشەی (نەخێر) دەزانن، کە ئەمەش شوێنەواری خراپ لە دەروونی خەسوودا بەجێدەهێڵێت و هەست دەکات کە هاوسەری کوڕەکەی فەرامۆشی دەکات.

بۆ خۆپاراستن لەو هەستە وشەی (بەڵێ) بەکاربهێنە هەرچەندە قسەکانیشی لای تۆ ڕاست نەبن، جا دەتوانی ئەوجارە قسەکەی بەگوێ بکەیت، یان هەوڵی گۆڕینی بدەیت بەبێ ئەوەی هەست بکات.

بۆنمونە ئەگەر خەسووت وتی: ئەو پێڵاوە هەڵبژێرە بۆ منداڵەکەت، دەتوانیت بڵێیت: بەراستی هەڵبژاردنێکی گونجاوە، بەڵام ئەی ئەم جووتەت بەلاوە چۆنە؟ ئایا لەگەڵ جلوبەرگەکەی ناگونجێت؟ لەم کاتەدا هەست دەکات کە هاوسەری کوڕەکەی بەرپەرچی نەداوەتەوە و بەڵکو بەهەردوکیان شتێکی باشتریان هەڵبژاردووە.

**٢.لە هەڵەکان ببورە:**

کێ لە ئێمە هەڵە ناکات؟ هەمووومان هەڵەمان هەیە و جاری وا هەیە کردەوە و هەڵسوکەوتێك دەکەین بەبێ بیرکردنەوە، ئەمەش لای بەتەمەنەکان زۆرترە، بۆیە لەلایەن خەسوتەوە چاوەڕێی ئەو هەڵە زۆرانە بکە، بەتایبەت لە سەرەتای یەکترناسینەوە، بەڵام دەبێت لێبوردنی زۆرت هەبێت، وا مامەڵە مەکە کە هەر قسە و هەڵسوکەوتێك واتایەکی خۆی هەیە و مەبەستدارە و دەبێت لە مەبەستەکەی تێبگەیت. . . بەڵکو سادە مامەڵە بکە. ئەگەر بە قسەیەك بێزاری کردیت، زۆر بیری لێ مەکەرەوە و روو لەو قسەیە وەربگێڕە، ئەگەر وانەکەیت سەرەنجامی خراپی لەسەر خۆت و هاوسەرت دەبێت و هەمیشە دەبێت هەوڵی پڕکردنەوەی بۆشایی و وەڵامی رەخنەکانی تۆ بێت، وریابە. . . بیرت نەچێت کە ئەو دایکی مێردەکەتە هەمیشە ناتوانێت بە هەڵەکانی مامەڵەی لەگەڵدا بکات چونکە لەهەمان کاتدا ئەو دایکێتی و خۆشەویستی بۆی هەیە. . . تۆش رێز لەو خۆشەویستیە بگرە.

**٤.ڕێزی بگرە:**

ئافرەتی زیرەك کە مەبەستی ئەوەیە لانەی خۆی لە تێکچون بپارێزێت، دەبێت کەسایەتییەکی خۆشەویستی هەبێت لای کەسوکاری مێردەکەی بەتایبەت لای دایکی، بۆیە ڕێزگرتنی خەسوو هەستی خۆشەویستی بۆ بوکەکە لای خەسوو دروست دەکات، ئەگەر قسەی کرد گوێی بۆ بگرە با چەندجارێکیش دووبارەی بکاتەوە، چونکە ئەوە وای لێدەکات کە هەست بە ڕێزی تۆ بکات بەرامبەری، سەرەنجام ئەو دایکە هەست دەکات کچێکی بۆ زیادبووە، نەك کوڕێکی لەدەست چووە.

**٥.بە زەوق و چێژێکی ساغەوە مامەڵەی بکە:**

جوان مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵك ئەسیریان دەکات بەتایبەت ئەگەر ئەو کەسە خەسوو بێت کە هەمیشە چاوەڕێی هەڵەی تۆیە، ئەگەر تۆ بەجوانی مامەڵەت لەگەڵ کرد و بوارت نەهێشتەوە بۆ ڕەخنەکانی، دەتوانیت سەربکەویت و مامەڵەی ئەویش بگۆڕیت.

**٦.مێردەکەت لە دایکی نزیک بخەرەوە:**

کاتێك دایك دەبینێت کوڕەکەی ژنی هێناوە هەست دەکات ئەو کوڕەی لەدەست چووە، چونکە ئیتر سەرقاڵی ئافرەتێکی تر دەبێت و لەو جیادەبێتەوە، ئەمەش وای لێدەکات رق و توڕەیی هەبێت بەرامبەر بوکەکەی.

جا ئەگەر دڵنیا بوو هاوسەری کوڕەکەی بۆتە هۆی توندکردنەوەی پەیوەندی مێردەکەی بە کەسوکاری، ئیتر ئەو ترسەی نامێنێت و ئارام دەبێتەوە و دەزانێت کوڕەکەی لەدەست نەچووە، چونکە دەبینێت هاوسەرەکەی هانی دەدات کە رێز لە دایك و باوك و کەسوکاری بگرێت و سەردانیان بکات، بۆ ئەمەش مانای ئەوە نیە ئەو نەخشەی ژیانی ئێوە بکێشێت، نەخێر... تەنها ئەوەندە مەبەستمانە تۆی هاوسەر وا دابنێ ئەو خەسووە تۆی، یان دایکت بخەرە جێگەی، حەزدەکەیت چۆن مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت، ئەو مامەڵەیەش لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا بکە، لەبیرت نەچێت، ئەگەر مێردەکەت بۆ کەسوکاری چاك نەبێت دوارۆژ بۆ تۆ و منداڵەکانت چاك نابێت.

**٧.هەمیشە سوپاسی بکە:**

هەمووومان هەست بە دڵخۆشی و شادی و ڕەزامەندی دەکەین
کە ببینین بەرامبەرمان پێزانن بەرامبەر ئەوەی ئەنجامی دەدەین،
بەڕاستی مامەڵەی خەسوو وەك دایکێك، هەرچەندە دایك
چاوەڕێی سوپاسی تۆ نیە، بەڵام سوپاسکردن و دەربڕینی پێزانین
بەرامبەر چاکەکانی هەستێکی جوانی لا دروست دەکات،
وامەزانە کە خۆشەویستی خەسووت وادەکات چاوەڕێی هیچت
لێنەکات، بەڵکو هەمیشە چاوەڕێی سوپاسی تۆیە.

بۆنمونە ئەگەر لەماڵ نەبوویت و چاودێری منداڵەکانتی کرد،
کە گەڕایتەوە بڵێ: زۆر سوپاست دەکەم و بە چاکەکانت دەزانم،
بەڕاستی ئەگەر تۆ نەبویتایە نەمدەزانی چیان لێبکەم.

ئەم وشانە شوێنەواری گەورەیان دەبێت لەسەر دڵ و دەرونی
و زیاتر هانی دەدات کە ئەو خزمەتە دووبارە بکاتەوە.

چەندجوانە ئامۆژگاری بانگخوازی ئیسلام خاتوو (زەینەب
غەزالی) بە ناونیشانی (مەشخەڵی مامەڵە کردنی دایکی مێرد و ژنی
کوڕ).

دەڵێت: "گفتوگۆیەکی هەستیارت لەگەڵ دەکەم، دەزانم زۆر پێویستە، چونکە زۆرجار خێزانی بەختەوەری شێواندووە، زۆرجاریش باڵی کێشاوە بەسەر خێزانێکدا و بەختەوەری کردوون، ئەویش پەیوەندی نێوان (بوك و خەسوو)ە.

چەند جوانە لەسەر بنەمای دایکێك بۆ دوو هاوسەر مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، چونکە خەسوو ئەو درەختەیە کە مێردەکەی تۆی بەرهەم هێناوە و پاشان بە سێبەری خۆی پاراستویەتی و لە ئاوی ژیانی خۆی گۆشی کردووە، تا بۆتە ئەو بەرهەمەی کە دڵەکان کەمەندکێش دەکات و ئاواتەخواز دەبن بۆی، تۆ ئەی کچی شیرینم بوویتە ئەو کەسەی بەروبومی ئەو درەختەت لێکردۆتەوە، ئایا پێت خۆشە ئەو درەختەی مێردەکەتی بەرهەم هێناوە ببڕیتەوە؟!.

من بانگەشەی تۆ دەکەم لەژێر سێبەریدا دوعا گوێبیت و ئاوی ئەو درەختە بدەیت کە خەسووتە، کچەکەم ئەگەر گوێڕایەڵی خوا بیت لە بەرامبەریدا، پاداشتی گەورەت لای خوایە، خوا فەرمانی کردوە بە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، تۆ چەندە هەوڵی رازی

کردنی دایك و باوکت دەدەیت و کارێك دەکەیت خۆشحاڵیان بکەیت، لەگەڵ دایکی هاوسەرەکەشت وا مامەڵە بکە و لەبەرامبەری لە خوا بترسە، چونکە ئازاردانی دایك و باوك یەکێکە لە گوناهە گەورەکان.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **(الا ادلُكُمْ على اكْبَرِ الكَبائرِ؟. قالوا: بَلى يا رَسُول الله. قال: الشرك بالله و عقُوق الوالِدَين و شهادَة الزور)** صحيح البخاري (٥٩٧٦).

گرنگە یارمەتی هاوسەرت بدەیت تا چاکەکار بێت لەگەڵ دایك و باوکی، هەمیشە بەو شێوەیە ئامۆژگاری بکە تۆ لەگەڵ دایکی مێردەکەت هاوسۆزیت، جا ئەگەر بینی کوڕەکەی توڕەت دەکات، ئەویش توڕە دەبێت هەتا ئاسودە دەبیت، بەختەوەریش ئەوەیە کە ئاوێتەبوون لە نێوان خێزانی پیاو و خێزانی ژن دروست بێت و خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی لە نێوانیاندا بێت.

بۆیە داوا دەکەم لە تۆی بەڕێز کە ببیتە کچ و هاوڕێ و خۆشەویستی خەسوت، تا ئەویش ببێتە دایك و هاوەڵ و خۆشەویست بۆ تۆ... هیوادارم بیر لە وشەکانم بکەیتەوە". [1]

---

[1] www.balagh.com/woman/npsa

**سێیەم: رۆڵی خەسوو (دایکی مێرد) لە چارەسەری کێشەکاندا:**

دەبێت دایك بزانێت کە ژن هێنان و شووکردن یاسای بونەوەرە و کارێکی سروشتیە، پەیوەندی باوك بە هاوسەر و منداڵەکانی فەرمانێکی خواکردی خۆرسکە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئارامی و دڵسۆزی وبەزەیی بەدی بێت ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم: ٢١.

ئەگەر دایك ئەم راستییەی زانی ئارام دەگرێت، ئەگەر یادەوەرییەکانی رابردوو بێنێتەوە پێش چاوی خۆی دەزانێت کە ئەویش رۆژێك لە رۆژان کاریگەر بووە بە مێردەکەی و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی لە نێوانیاندا بووە، ئیتر شتێکی نامۆ نیە ئەگەر ببینێت جگەر و دڵی کە کوڕەکەیەتی گرنگی دەدات بە هاوسەری و چاودێریان دەکات، پێویستە بزانێت کە بەختەوەری دایك بەستراوە بە بەختەوەری وەچە و منداڵەکانیەوە، چونکە وەکو ئەو درەختە وایە کە لق و چڵەکانی لە دەوری کۆبونەتەوە و سێبەر بۆ خەڵك دروست دەکەن.

جا ئەگەر ئێمە باسی رۆڵی دایك بکەین دەبینین هەندێك دایك بە بێئەوەی خۆی هەست بکات دەبێتە مایەی خەم و پەژارە و زیان بۆ کوڕەکەی، کە پێشتر زۆر دڵسۆزانە هەوڵی داوە ئاسودە بێت و هەوڵی ژن هێنانی بۆ داوە، بەڵام مامەڵەی خراپی دوای ژن هێنانی کوڕەکەی دەبێتە مایەی نائارامی کوڕەکەی، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەست دەکات کوڕەکەیان لێ بردووە و کوڕەکەی دڵی بەلایەکی تردا رۆیشتووە، بۆیە دەیەوێت ئەو دڵە بگێڕێتەوە، زۆر جار بوغز و کینە وای لێدەکات کە هەوڵبدات کوڕەکەی لە هاوسەرەکەی جیابکاتەوە، بەڵێنی ئەوەشی دەداتێ کە هاوسەرێکی چاکتری بۆ بدۆزێتەوە لەگەڵ ئەوەی هاوسەری کوڕەکەی شیاو و گونجاو و جوان و رەوشت بەرزە.

هەندێك دایك کاتێك دەبینن کوڕەکانیان لەگەڵ هاوسەرەکانیان دڵشاد و بەختەوەرن، یان رێزی هاوسەرەکانیان دەگرن، ئاگری غیرە و توڕەیی لە دەرونیاندا کڵپە دەسەنێت و هەوڵی تێکدانی ئەو ئارامیە دەن کە سەرەنجامی باشی نابێت، هەندێك دایك زۆر بە رەقی و زبری مامەڵە لەگەڵ هاوسەری

کوڕەکەیان دەکەن و کەم و کوڕییەکان گەورە دەکەن و درۆی بۆ هەڵدەبەستن.

جا ئەی دایکی بەخشندە.. ئەی ئەو کەسەی کوڕەکەت خۆشدەوێت و ئاواتی بەختەوەری بۆ دەخوازیت.. وریابە مەبەرە هۆکاری شێواندن و تێکدان و خاپورکردن، مەبەرە ئاگرێك کە کەش و هەوای خێزانێك بسوتێنیت، تەسلیمی خەیاڵ و بیرکردنەوە وەهمیەکان مەبە کە پاکی و بێگەردی نێوانتان دەشێوێنێت، پەیوەندیت لەگەڵ هاوسەری کوڕەکەت با پەیوەندیەکی دوژمنایەتی نەبێت، بەڵکو ببەرە دایك تا ئەویش ببێتە کچ بۆ تۆ و چاکەت لەگەڵدا بکات، لێبوردنت هەبێت بەرامبەر هەڵەکانی، ئەگەر کەم و کوڕیت بینی بە نەرم و نیانی ئامۆژگاری بکە ئەوکاتە تۆش و ئەویش بەختیەوەر دەبن، بەڵکو چاکەت لەگەڵ دەکات و دیاریت پێشکەش دەکات، تۆش دڵە گەورەکەتی بۆ دەکەیتەوە و بارانی میهرەبانی بەسەردا دەبارێنیت و دوعای بۆ دەکەیت، خوای گەورەش پارێزگاری لە تۆ دەکات و بەخشندە و بەسۆز دەبێت بەرامبەرت.[1]

---

[1] حقوق الوالدين – محمد بن ابراهيم الحمد – ص ٢٠-٢١.

چەندجوانە ئامۆژگاریەکانی مامۆستا (زەینەب غەزالی) کە بانگی خەسوو دەکات و پێی دەڵێت:

تۆش ئەی خەسووی خۆشەویست، ئومێدەوارم ئاگاداری هۆکاری پاراستنی کوڕەکەت بیت، بیرتە ڕۆژی زەماوەندەکەی چەند ئاسودە و خۆشحاڵ بویت؟ ئەوکاتە تۆ بڕیارت دابوو کە هاوسەری کوڕەکەت وەك کچی خۆت بڕوانیت، کەواتە بۆ لەدوای ژن هێنان؟ ئەوە هەر ئەو ئافرەتەیە کە لە ئامێزت گرت و خۆشحاڵی دەمارە خوێنەکانتی پڕ کرد و لە ڕومەت و دیدارتدا دیاربوو؟ ڕۆژی ئاهەنگیش خۆشەویستیت بۆ دەربڕین؟ کەواتە دوای بەیەکتر گەیشتنیان چی وا تورەی کردویت؟!.

کوڕەکەت و هاوسەرەکەی؟ بەراستی گلەییت لەسەرە ئەگەر وەك کچی خۆت سەیری نەکەیت و میهرەبان نەبیت لەگەڵیدا، ئایا پێویست نیە ئەو خۆشەویستیەی بۆ کچەکەت و زاواکەت دەریدەبڕیت بۆ کوڕ و بوکەکەشت دەریببڕیت؟!.

خۆشەویستم... دادپەروەری شەریعەتی خوایە، بەخۆتدا بچۆرەوە لە پەیوەندیت لەگەڵ هاوسەری کوڕەکەت، بچۆ لە

قورئاندا مانای سۆز و بەزەیی بخوێنەرەوە، وەچەکانت لەپێشترن بەو سۆز و بەزەییە، دەی مێردەکەی کوڕی تۆیە، پارچەیەکە لە جگەرت، منداڵەکانی وەچە و نەوەی تۆن، کەواتە دڵت پڕ لە خۆشەویستی بکە بۆ هاوسەری کوڕەکەت و منداڵەکانی کە نەوەی تۆن، بۆ ئەوەی ماڵەکەتان لەسەر بناغەی ڕۆشنایی خوایی دروست بێت.

ماڵی وێران و پڕ لە کێشە ئەو ڕۆشنایی و نورەی نیە، ماڵی کوڕەکەت لە دوعا و پاڕانەوە بەکوڵ و چاکەکانت بێبەش مەکە، ماڵ و سامان دەڕوات و تیادەچێت، تەنها مانا جوانەکانی ژیان دەمێنێتەوە، بەسۆزبە لەگەڵ خێزاندا، بەشوێن هەڵە و کەم و کورتی و ناتەواوی هاوسەری کوڕەکەتدا مەگەڕێ، بەڵکو ئامۆژگاری کە، بزانە ئەو نەوەی ڕۆژگارێکە جیاوازە لە ڕۆژگاری تۆ، کەواتە بۆی ببە بە دایکێکی میهرەبان و خوشکێکی ڕاست و دڵسۆز، جا دڵنیابە ئەویش وەك کچێك و هاوەڵێك مامەڵەت لەگەڵ دەکات و ئەوساش ئاڵای بەختەوەری لەسەر ماڵتان دەشەکێتەوە.[1]

[1] www.balagh.com/woman/npsa

**چوارەم: رۆڵی دایکی ئافرەت (ژن) لە چارەسەری کێشەکاندا:**

بە دایکی ئافرەتی شووکردو دەڵێم: ئەی دایکی بەسۆز ئامێزی گەرم، دڵە گەورەکە، دڵنیام تۆ کچەکەت خۆشدەوێت و ئاواتی بەختەوەری دەخوازیت، بەڵام ئەگەر زۆر سووربیت لەسەری.. رەنگە نەزانیت و بچیتە ژیانی تایبەتی هاوسەرداریەوە، کێشەی بچوك دەست پێدەکات و گەورە دەبێت، لەدوای ئەوە هیچ سودێکی نابێت و بەختەوەرییەك کە لە دەستتدا ناگەڕێتەوە.

جوانترین ئامۆژگاری کە پێشکەشی تۆی بکەم ئەوەیە: خۆت لە کاروباری تایبەتی کچەکەت هەڵمەقورتێنە، بەڵکو هەمیشە ئەوە بیری کچەکەت بخەرەوە کە چاکەکار و گوێڕایەڵ بێت لەگەڵ مێردەکەی و هەوڵبدات رازیی بکات، بەڵام چۆن دڵی مێردەکەی رابکێشێت و بەختەوەری بکات؟ ئەو کارانە چین کە ئافرەت لای مێردەکەی خۆشەویست دەکات؟!.

ئەو شتانەی فێربکە کە کچەکەت نایزانێت، یارمەتی بدە بۆ ئەوەی خێزانێك دروست بکات کە لەسەر بناغەی ئایین و رەوشتی

جوان و مامەڵەی بەرز دروست بێت، ئەگەر شکات و سکاڵای لە مێردەکەی هەبوو، تۆش ئەوەندەی تر ناشرینی مەکە، بەڵکوە خۆشەویستی بکە، فێری ئارامی و زوبان شیرینی بکە و ئامۆژگاری چاکەی بکە، وریابە بەهۆی تۆوە کڵپەی ئاگری نێوانیان زیاد نەکات.

ئەی دایکی میهرەبان، مێردی کچەکەت بکەرە کوڕی خۆت، چیت بۆ کوڕەکانت پێخۆشە بۆ مێردی کچەکەشت پێتخۆش بێت، بە نەرم و نیانی و میهرەبانی مامەڵەی بکە، گوێی بۆ بگرە و سەردانی بکە و هەمیشە بیری بخەرەوە کە تۆ بەختەوەری کچەکەت بەلاوە گرنگە، بیر لەو ئامۆژگاریانە بکەرەوە کە ئافرەتە دەشتەکیەکە لە شەوی گواستنەوەی کچەکەیدا پێی وت.

**پێنجەم: ڕۆڵی باوکی (ژن) لە چارەسەری کێشەدا:**

بەراستی باوکی (ژن) ڕۆڵێکی گەورەی هەیە، ئەگەر سەیری مێژوو بکەین لە پێغەمبەر ﷺ گەورەتر و مەزنترمان دەست ناکەوێت بۆ چارەسەری گرفتەکان، بڕوانەچۆن مامەڵە لەگەڵ (فاطمە)ی کچیدا ﵂ دەکات و هەواڵی دەپرسێت و چۆن لەگەل (عەلی ﵁) مامەڵە دەکات و بە شوێنیدا دەگەڕێت کاتێك فاطمە ﵂ دەڵێت: تورە بووە و چۆتە دەر. پێغەمبەر ﷺ بۆی دەگەڕێت، نەرم و نیان دەبێت لەگەڵیدا و واز ناهێنێت تا دەیباتەوە ماڵەوە و عەلی ﵁ دەرگای ماڵەکە دادەخات و خۆشی دڵ و دەرونی پێغەمبەر ﷺ دەگرێت، وە زۆرجار پێغەمبەر ﷺ سەردانی فاطمە ﵂ دەکات، بۆیە باشترین باوك بووە بۆ منداڵەکانی.

یان چۆن مامەڵەی لەگەڵ (عثمانی کوڕی غەففان ﵁) کردووە کە مێردی (روقیە ﵂) و لەپاش ئەویش (ام کلثوم ﵂) بووە، کە کاتێك ئەویش وەفاتی کرد بە (عثمان)ی فەرموو: ئەگەر کچی سێهەمیشمان هەبوایە، دەمانکردە هاوسەرت ئەی عثمان.

ئینجا بزانە پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ (ئەبی عاصی کوڕی ڕەبیع)ی مێردی کچەکەی کرد... هەموو ئەم نمونانە لە ژیانی

پێغەمبەر ﷺ ئەوە بۆ (باوکی کچ) (خەزوری کوڕ) ڕۆشن دەکاتەوە کە چۆن مامەڵە لەگەڵ مێردی کچەکەیدا بکات و چۆن دڵی ڕازی بکات و کێشەکان بە ژیری و بە وردی و ئامۆژگاری جوان چارە بکات.

ئەو شتانەی کە پێویستە باوك لەگەڵ مێردی کچەکەیدا ڕەچاوی بکات لە پێشدا ئەوەیە کە: ئەرکی زەماوەند و ناومالّ و ئامادەکاری لەسەر قورس نەکات، بەڵکو پێویستە ئیشەکان ئاسان بکات مادەم کوڕەکەی بەدڵە و کەسێکی چاکە، بۆ ئەوەی دوای دروستکردنی ژیانی هاوسەری قەرزاری ماندویان نەکات و ژیانیان لێ نەشێوێنێت، چونکە ئەوکاتە ژیانی کچەکەشی دەکەوێتە ناخۆشی و غەم و پەژارە، ئینجا باوکی کچ کە دەبینێت ماڵی کچەکەی پەژارە و خەفەت چواردەوری داون و قەرزارن، کاریگەر دەبێت و خەم و خەفەت لە کچەکەی دەخوات، بۆیە تکایە ئاسانکاری بکەن و ئاسانکاربن ئەی باوکی کچەکان...

هەروەها لەسەر باوك پێویستە بەردەوام هانی کچەکەی بدات بۆ ڕێزگرتنی هاوسەرەکەی و گوێڕایەڵی و جوان مامەڵە کردن وپاراستنی ماڵەکەی، لێرەشدا باوك ڕۆڵێکی کاریگەر و بەرچاوی دەبێت.

# بەشی پێنجەم

## گرفت و چارەسەر

١. دایکی هاوسەرەکەم ئەوەی بۆ کچەکەی پێ خۆشە بۆ منی پێ خۆش نیە!!.
٢. چاکە لەگەڵ دایك و باوك و ڕەزامەندی هاوسەرم.
٣. ئایا خێزانەکەم لە ماڵی کەسوکارم دەربکەم؟!.
٤. لە نێوان هاوسەرەکەم و دایکیدا.
٥. مێردەکەم لە کەسوکارم تووڕەیە!.
٦. خەسووم یان دوژمنم.
٧. خەسووم دەیەوێت کچەکەم بکاتە موڵکی خۆی.
٨. خۆگونجان لەگەڵ کەسوکاری مێردم.
٩. خێزانەکەم دوژمنایەتی کەسوکارم دەکات.
١٠. باوك و دایکم قسەی ناشرین بە هاوسەرەکەم دەڵێن!.
١١. ژنەکەم ڕۆژانە سەردانی دایکی دەکات.
١٢. لە دوودڵیدام لە گرنگیدان بە خەسووم.
١٣. ژنەکەم و خەسووی لە خێزانێکدا.
١٤. کەسوکارم دەیانەوێت ژنەکەم پێ تەڵاق بدەن، چی بکەم؟!.
١٥. عەورەتی دایکی ژن بەرامبەر بە مێرد.
١٦. هەڵوێستم لە بەرامبەر ململانێی ژنەکەم و دایکم.

پێویست بوو لەم کتێبەدا کۆمەڵێك گرفتی واقعی لەسەر زوبانی خاوەنەکانیانەوە بۆ خوێنەران تۆمار بکەم، لەگەڵ چارەسەری گونجاو بۆ ئەو گرفتانە.

لەدوای یارمەتی خوا، پشتم بەست بە هێڵی ئەلیکترۆنی (ئینتەرنێت) و لە سایتی (المستشار) کە باس لە گرفتە خێزانی و پەروەردەیی و دەروونی و پزیشکیەکان دەکات، لەوێدا ئەوەی بە شیاوم زانیبێت و سودی بۆ بابەتەکەی ئێمە هەبێت وەرم گرت، لەگەڵ رێگەچارەی ئەو گرفتانە کە لەلایەن مامۆستایانی پسپۆڕ دیاری کراون.

منیش بە شێوازێکی تر پرسیار و وەڵامەکانم دارِشتەوە، لەگەڵ (تخریج) کردنی فەرمودەکان، هەروەها یارمەتیم لە هەندێك فەتوای لیژنەی بەردەوامی فەتوا لە سعودیە و میصر وەرگرت، لەخوا داواکارم زیاتر لە پەیامەکەی شارەزامان بکات.

**یەکەم: دایکی مێردەکەم ئەوەی بۆ کچەکەی بە ئاواتی دەخوازێت بۆ منی بە رەوا نابینێت.**

" سلاَوی خواتان لێ بێت.

هیوادارم زوو وەلاَمم بدەنەوە، خوا پاداشتان بداتەوە:

دایکی مێردەکەم مرۆڤێکی بەڕێز و رەوشت بەرزە، بەتایبەت لەگەلَ من، و لەگەلَ کەسوکارم، لەم رووەوە نامەوێت ستەمی لێبکەم...

بەلاَم ئەوەی تێبینی دەکەم لە هەندێك کاتدا کە بۆ نمونە بە گەشت و سەفەرم رازی نیە لەگەلَ مێردەکەم، ئەمە لە دەم و چاویدا تێبینی دەکەم، و لە شێوازی قسەکانیدا، بۆ زانیاریش ئەو کچێکی شووکردوی هەیە، زۆر خۆشحالَە کە کچەکەی لەگەلَ هاوسەریدا سەفەر و گەشت دەکات، ئەمە زۆر بێتاقەتی کردووم، من دەمەوێت بۆ منیش خۆشحالَ بێت وەك کچەکەی.

لە لایەکی ترەوە ئەو پێی خۆش نیە کە کەسێك باسی چاکە و ستایشی من بکات، نازانم هۆکاری چیە؟

لە لایەکی ترەوە زۆرجار داوای مەسرەفی زیادە لە مێردەکەم دەکات لە کاتێکدا کوڕی تری هەیە، کچی هەیە و هاوکاری دەکەن و مێردەکەم لە هەندێك مەسرەفدا وەك کرێی شۆفێر و خزمەتکاربەشداری دەکات، لێرەشدا هەست دەکەم کچێکی زۆر دەوری هەیە لەمەدا، ئەمەش زۆرتر بێتاقەتم دەکات لە کاتێکدا ئەوان دەزانن کە کوڕەکەیان مەسئولیەتی لەسەر شانە و پێویستی بە کۆکۆدنەوەی ماڵ هەیە " .

## وەڵامی راوێژکار ( د.عبدالعزیز عبدالله المقبل ):

خوشکی رێزدارم . . . لە قسەکانتدا هەست دەکەم ئافرەتێکی دامەزراو و چاکەخوازیت، هەر ئەوەی راوێژ بە خەڵکی دەکەیت نیشانەی ژیری و پێگەیشتنە، ئەمەش بەخششێکی گەورەیە و سوپاسی خوای پێویستە . . .

زۆر سەرسامم لە دادپەروەریت لە هەڵسەنگاندنی دایکی مێردەکەت، هەرچەندە گرفت هەیە و بێزارت دەکات کەچی تۆ دەربارەی دەڵێیت : "دایکی مێردەکەم کەسێکی چاکە " . . .

هەست دەكەم مامەڵەت لەگەڵیدا چاك بێت، بۆیە ئەویش جوان مامەڵەت دەكات كە دڵنیای خۆشی دەوێیت.

كاكڵەی گرفتەكانت ئەوەیە: دایكی مێردەكەت روانگەی بۆ كوڕ و كچەكانی جیاوازە.

كچی بەڕێزم...

دایكی مێردەكەت راستەوخۆ ئەو شتەی بۆ دەرنەبڕیویت كە پێی ناخۆش بێت لەگەڵ مێردەكەت سەفەر بكەیت، بەڵام بە پێی قسەی خۆت (ئەوە هەست پیّ دەكەیت لە قسە و دەموچاویدا)!.

ئەمەش ئەگەر لە روانگەیەكی ترەوە سەیری بكەین راڤەكەی ئەوەیە كە تۆ ئافرەتێكی هەستیاریت!.

چونكە دەڵێیت: "هەندێك جار"، ئەمەش ئەوە دەردەخات كە هەستەكانت هەندێكجار ئەو روانگەیەت بۆ دروست دەكات بەرامبەر (دایكی مێردەكەت).

بەڵام ئەوەی باست كردووە كە خەسووت پێی ناخۆشە لەگەڵ مێردەكەت گەشت بكەیت، ئەوە لە واقیعدا بوونی هەیە و هەندێك دایك وا دەڕوانن، بەڵام هەست ئەكەم دایكی مێردەكت

زۆر زیرە، هەرچەندە بە تەمەنە و ئەوەش هەندێك باری تەندروستی دروست دەكات و وەكو منداڵی لێ دێتەوە و زوو هەڵدەچێت و ناتوانێت كۆنترۆڵی خۆی بكات، بەڵام لە قسەكانی تۆشدا وا دەردەكەوێت كە رازی نەبوونی هەموو كاتێك نیە، بەڵكو هەندێك جار وایە، رەنگە ئەو كاتانە بێتاقەت بێت و حەز بكات كورەكەی لەلای بێت، یان ئەو كاتە ئەوكورەی لە هەموویان خۆشەویستە، یان وا هەست دەكات سەفەر و گەرانەكانتان زۆرە (بە شێوەیەك لە شێوەكان) بەڵام ژیری وای لێدەكات خۆی رابگرێت و بۆچونی خۆی نەسەپێنێت بەسەرتاندا، جا ئەگەر تەنها لە دەموچاویدا یان رەنگیدا ئەو رازینەبونە دیاربێت و دەرینەبرێت، لەم بارەدا سەرزەنشت ناكرێت.

**دووەم: چاکە لەگەڵ دایك و باوکم، ڕەزامەندی هاوسەرم.**

"من گیرۆدەی ئەوەم کەدایکم لێم ڕازی نییە، چونکە دوای ژنهێنان لەماڵ جیابومەوە و ماڵێکم گرت بۆخۆم، هەست دەکەم دایکم لەگەڵ هاوسەرم ساردە، منیش حەزناکەم ڕوبەڕووی ببمەوە، یان بێفەرمانی بکەم، هەندێك جار دایکم ڕازی دەکەم هاوسەرم تورە دەبێت، جا چی بکەم؟ تکا دەکەم بە خێرایی وەڵامم بدەنەوە".

**وەڵامی ڕاوێژکار (أ.منیرە ابراهیم العبد الهادی):**

ئەی ئەو کوڕەی هەوڵی چونە بەهەشتتە... سڵاوت لێبێت.

مافی دایك و باوك زۆر گەورەیە و خوای مەزن لەپاڵ مافی خۆیدا باسی دەکات، ئایەت و فەرمودەش لەوبارەویەوە زۆرن، بەڵکو هەرچەندە بێباوەڕیش بن، هەر خوا فەرمانی کردووە بە چاکەکاری لەگەڵیاندا ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ لقمان: ١٥.

بۆیە گوێڕایەڵییان لە هۆکاری چوونە بەهەشتە، ئەبوهورەیرە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو:

(رغم انفُهُ ثُم رغم انفُهُ ثم رغم انفُهُ، قيل: من يا رسول الله؟ قال: منْ ادرك والِديهِ عند الكِبر احَدُهُما او كليهما ثم لم يَدخلِ الجنة) رواه مسلم.

هەروەها چاکەکردن لەگەڵیان هۆکاری لابردنی بەڵاو موسیبەتە، مایەی فراوانی رۆزی و بەرەکەتداربوونی تەمەن و عاقیبەت خێری یە، بۆیە سوربە لەسەر ئەوەی لەو کەسانە نەبیت کە رەزامەندی ژن پێشدەخەن بەسەر رەزامەندی دایك و باوکدا، هەوڵبدە داواکاری هەردوولا هاوسەنگ رابگرە و مافی هەردوولایان بدە.

بەراستی کارێکی ژیرانە نیە پلەوپایەی دایك لەگەڵ پلەی هاوسەر هەڵبسەنگێنیت.

بۆیە پەیوەندیت لەگەڵ دایکت و هاوسەرت خۆشبکە بێئەوەی لەسەر حیسابی بەرامبەرەکەی بێت یان کەمتەرخەمی لە بەرامبەر یەکێکیاندا، ئەوە مەسەلە گرنگ و جەوهەریەکەیە،

هەوڵبدە بە دیاری و وشەی جوان لێکیان نزیك بخەیتەوە، ستایشی یەکتریان بۆ بگوازەرەوە، هەوڵبدە ببیتە پەیامبەرێکی میهرەبان لە نێوانیاندا.

خوای گەورە کارئاسانیت بۆ بکات بۆ جێبەجێکردنی ئەرك بەرامبەر خوای گەورە و بەرامبەر دایك و باوکت، خوای گەورە منەتبارمان بکات بەوەی دایك و باوکمان لێمان رازی بن و بمانگێرێت لەو کەسانەی پێشبڕکێ لەسەر خێر و چاکە دەکەن و سەرەنجام بە بەهەشت شاد دەبن.

## سێیەم: ئایا ژنەکەم لە ماڵی کەسوکارم دەربکەم؟.

"من ماوەی سێ ساڵە خێزاندارم و لەناوچەیەك کاردەکەم (٦٠٠کم) دوورە لە پایتەختی وڵاتەکەم، خێزانەکەم لای کەسوکارم بەجێ هێشتووە، مەبەست ئەوەبوو کە یارمەتی دایکم و خوشکەکانم بدات، بەڵام گرفتەکان زۆربوون لە نێوان دایکم و خوشکەکانم لەلایەك و خێزانم لەلایەکی ترەوە، ئەوان بەراستی مامەڵەی خراپی لەگەڵ دەکەن و قسەی پێ دەڵێن، ئەو هەر بێدەنگە و ئەویش لەبەر قسەی من، ناشتوانم خێزانم لەگەڵ خۆم ببەم بۆ شوێنی کارەکەم چونکە کوڕە گەورەم و یارمەتی باوکم دەدەم بۆ کاروباری ماڵ، مەبەستیشم ئەوەیە دایك و باوکم توڕە نەکەم، زۆر هەوڵم لەگەڵ داوە، چەندین جار هەڕەشەم کردووە بەوەی کە هاوسەرەکەم لەگەڵ خۆم دەبەم بۆ شوێنی کارەکەم، بەڵێنیان داوە کە چیتر وانەکەن و وازبێنن، بەڵام دوایی دەچنەوە سەر هەمان بەزمی کۆن.

داوای یارمەتی دەکەم" . . .

**وەڵامی راوێژکار ( مامۆستا عبدالكريم دەخیل ئەلشعیل ):**

سوپاس و ستایش بۆخوا و سەلام لەسەر گەورەی پێغەمبەران ﷺ، لەپاشان:

بەراستی خێزانت مافی ئەوەی هەیە جێگەی تایبەت بەخۆی هەبێت، مادەم گوێڕایەڵی تۆیە نیشانەی ئەوەیە ئافرەتێکی چاکە، تۆش دەستی لێ بەرمەدە و رێزی بکرە.

بۆ چارەسەری گرفتەکەش، ئەوەیە کە خێزانت لەگەڵ خۆت ببەیت بۆ شوێنێکی نزیك لە شوێنی کارکردنت ئەگەر گونجاوە، یان بچێتە مەنزڵێك کە سەلامەت بێت و دوریش بێت لە خێزانەکەتان، ئەمەش مانای وانیە کە پەیوەندیان لەگەڵ بچرێنیت خۆت یان هاوسەرت، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێویستە سەردان و پەیوەندی و دیاری لە نێوانتاندا هەبێت دوای ئەوەی کە جیابوونەوە (خوای گەورە یارمەتیت بدات).

**چوارەم: لە نێوان مێردەکەم و دایکیدا:**

"١. مێردەکەم بەگوێم ناکات، ئەگەر بڕیار بدات شتێك بەگوێم بکات، دوایی سەرەنجامەکەی دەدات بەسەر مندا.

٢. زۆربەی کێشەکانمان لەسەر پارەیە، ئەگەر بمەوێت شتێك بۆخۆم یان دایك و باوکم بکڕم بەهۆی موناسەبەیەکەوە، توڕەدەبێت، لە بڕەپارەیەکی دیاریکراو زیاتر نابەخشێت کە ئەویش زۆر کەمە، بەردەوام دەڵێت خۆت سەرفی بکە، لەکاتێکدا من کارمەند نیم و کەسوکاریشم دەوڵەمەند نین، هەتا لەکاتی جەژندا بەتەڵاقی سوێندم دەدات کە داوای پارەی لێنەکەم یان داوای چونە بازاڕی لێنەکەم، دەشزانێت کە من لە تەڵاق دەترسم و ناچار ئارام دەگرم، بەڵام بەڕاستی بەختەوەر نیم.

٣. دایکی مێردەکەم لە زۆربەی کاتەکاندا بەهەڵەم دەزانێت، بەڵکو خوشکەکانیشی لۆمە و سەرزەنشتم دەکەن، چونکە من زۆربەی کات منداڵم لەبار دەچێت، بۆ نمونە ئەگەر بچم بۆلای پزیشکێك، خێرا هەزار شتی لێ دەدۆزنەوە و دەڵێن: ئەگەر بەگوێی ئێمەت بکردایە و بچوویتایە بۆلای فلانە پزیشك ئەوە

رووی نەئەدا، مێردەکەشم هاوڕایە لەگەڵیان و پشتیان دەگرێت، وام لێهاتووە ماندوبووم بەدەست مامەڵەی مێردەکەم و دایکیەوە و ویژدانم ئازارم ئەدات.

چیی بکەم؟ لەگەڵ ئەوەی لەم ڕۆژانەدا لای کەسوکاری خۆمم لەدوای منداڵبوونێکی ناوەخت کە لەسەرەتای حەوتمانگیدایە و منداڵەکەش لە خەستەخانەیە، دەمەوێت بکەڕێمەوە بۆ ماڵ تا چاودێری بکەم بەڵام لە ترسی ئەو قسانە نامەوێت بکەڕێمەوە تا سەرزەنشت نەکرێم لەلایەن مێرد و خەسووەکەم".

## وەلامی راوێژکار (د.نهی عدنان قاطرجی):

خوشکی بەڕێزم. . . سلاوی خوات لێبێت.

کێشەی تۆ دوو بەشە:

١ . کێشەت لەگەڵ مێردە چروکەکەتدا.

٢ . کێشەت لەگەڵ خێزانەکەیان کە هەمیشە سەرزەنشتت دەکەن، هەرچەندە باوەڕم وایە کە گرفتی دووەمت وات لێدەکات کە بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە لە ترسی تانە و تەشەر.

لێرەدا وا گونجاوە کە بەجیا باسی گرفتەکانت بکەین:

١ . دەربارەی مێردەکەت: کێشەکەت دوو بەشە:

یەکەم: لۆمە و سەرزەنشتکردنی بۆتۆ لەکاتی بڕیارداندا، وادیارە ئەم سیفەتە بۆماوەییە لەو خێزانەدا، ئەمەیە تۆی بێزار کردووە، بە پێچەوانەوە من لایەنێکی باشی تیا دەبینم، ئەویش ئەوەیە کە مێردەکەت زۆرت لێناکات بۆ پابەندبوون بە بۆچوونی ئەوەوە، لە هەموو هەڵوێستێکدا، تۆش هەرچەندە ئێستا لۆمە دەکرێیت، بەلام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا دەبیتە کەسێکی خاوەن

ئەزموون و بەجورئەت و ئازایەتی پەیدا دەکەیت بۆ بڕیاردان و مێردەکەشت هەست بەو سیفات و لێزانیەت دەکات.

بەڵام پێویستە بەئارام بیت و نەرم و نیان مامەڵە بکەیت و دان بە هەڵەکانتدا بنێیت، پێویستە پێش هەر بڕیارێك بەوردی لایەنەکانی بخوێنیتەوە و ئەگەرەکان بهێنیتە پێش چاوت دوای ئەوە بڕیار بدەیت.

٢. دەربارەی بەشی دووەم کە باسی روژدی و چروکیە بەڕاستی تاقیکردنەوەیەکی گەورەت تۆش بووە کە توشی زۆرێك لە ئافرەتان دەبێت، هەندێك لەو ئافرەتانە بۆ پاراستنی کەش و هەوای خێزانی ئارام دەگرن، هەشیانە هەڵدەگەڕێتەوە و بەو واقیعە رازی نابێت و واز لە هەموو شتێك دەهێنێت تا لە دۆزەخی بەخیلی رزگاری بێت. . . . بەڵام من وادەبینم کە مێردەکەت زۆر چروك نیە بەبەڵگەی ئەوەی پارەت دەداتێ بەڵام کەمە، ئەمەش شتێکی باشە، ئەوە بزانە هەرچەندە هەوڵ بدەیت ناتوانیت ئەو سیفەتە بگۆڕیت لە مێردەکەتدا و هەموو جارێك کە پارەت پێویست بوو، جەنگێك بەرپادەبێت تۆش لەگەڵ کاتدا لەسەر ئەوە رادێیت (دوعای خێر بکە، چونکە دڵەکان بەدەستی خوای پەروەردگارەوەن).

جا ئەگەر بوارت هەبێت و ئاستی زانستی گونجاوبێت بۆ دامەزراندی خۆت کارێکی باشە، ئەمە ئیجابیە، بەڵام خراپی لێرەدایە کە ئەوکاتەش مێردەکەت هەموو ئەرکەکان بخاتە سەر شانی تۆ، یان پارەت لێوەربگرێت بۆ پێویستیە تایبەتییەکانی، جوان بیری لێبکەرەوە و خراپە و چاکەکانی هەڵبسەنگێنە و بڕیار بدە.

٣. دەربارەی پەیوەندیت لەگەڵ خێزانی مێردەکەت، تەنها ئارام گرتن چارەسەرە، گەر گوێت لە قسەیەك بوو وابزانە هەر نەتبیستووە (کورد واتەنی فەرامۆشی بکە) ئیتر ئەو قسەیە کاریگەری لەسەرت نامێنێت، بەڵکو کاریگەری لەسەر ئەوان دەبێت کە دەبینن قسەکانیان فەرامۆش دەکرێت، یان هێور ببیتەوە و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەیت، و پێیان بڵێ کە لەبارچوون بڕیاری خوایە و دەسەڵاتی تۆی تێدا نیە و لە دەسەڵاتی پزیشکیشدا نیە، بەم شێوە قسە بکە و لەسەرخۆ بەو متمانەت بەخوا بەهێز بێت و داوای ئارامی لێبکە، ئیتر هەست دەکەیت پاش ماوەیەك بێزار و بێتاقەت نابیت لە قسەکانیان.

لە کۆتاییدا داوا دەکەیت (کە چی بکەیت؟)

خۆت وەڵامی خۆت دایەوە کە دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ ماڵ و چاودێری ماڵ و منداڵت بکەیت، ئەوەش نیشانەی عاقڵی و ژیریە، بەتایبەت کە خاوەنی منداڵێکیت و ئەویش پێویستی بە تۆ هەیە.

کەواتە خۆت چەکدار بکە بە ئیمان و باوەڕ و پشت بە خوای گەورە ببەستە و بزانە کە تۆ لەم قۆناغەدا کە دوای منداڵ بوونە کێشە زۆر بە گەورە دەبینیت، چونکە ئافرەت لەو قۆناغەدا لەرووی دەرونیەوە شڵەژاوە و بە بچوکترین شت کاریگەردەبێت، بۆیە گرفتەکە گەورە مەکە تۆ توانای بەرگری و پاراستنی خانەوادە و مێردەکەت هەیە، بواری شەیتان مەدە بێتە دڵتەوە، خواش یارمەتیت بدات.

**پێنجەم: مێردەکەم لە کەسوکارم تووڕەیە :**

" مێردەکەم لەگەڵ خوشکەکەم کێشەیان هەیە، دایکم لای خوشکەکەمە، منیش دەمەوێت سەردانی بکەم، چۆن قەناعەت بە مێردەکەم بکەم کە واجبی منە سەردانی دایکم بکەم لەکاتێکدا باوك و برام نیە تا قسەی لەگەڵ بکەن، ولاتەکەشی ولاتی خۆم نیە و لە خێزانەکەمەوە دوورە، لەگەڵ ئەوەی مامەڵەی خراپ نیە، بەلام دایکم لەرووی دەروونیەوە زۆر ماندووە، چونکە دوو مانگە منی نەبینیوە، بۆ زانیاریش ئێمە تەنها دوو خوشکین،نازانم چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەم، هەرکات باش دەبێت، باسی ئەوان دەکەم لەگەڵمدا دەگۆڕێت، چی بکەم؟ هۆکاری گرفتەکەش لەگەڵ خوشکەکەم ئەوەیە کە مێردەکەم ڕێزی دایکم ناگرێت، بەلام زۆر گرنگی بە کەسوکاری خۆی دەدات، دایکم زۆر هەوڵی داوە قسەی لەگەڵدا بکات، بەلام ئەو بەرپەرچی داوەتەوە. "

**وەڵامی راوێژکار (د. حنان قەرقوتی):**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.

سڵاوی خوات لێبێت . . .

بوونی جیاوازی لەنێوان ژن و مێرد لە ژیانی خێزانداریدا سروشتیە، بەمەرجێك لە سنوری خۆی دەرنەچێت، ژیانێکی بێگرفت و کێشە بە گشتی بوونی نیە، ئەوەش کە لەنێوان مێردەکەت و خوشکەکەت روویداوە، یەکێکە لەو گرفتانە.

کچی خۆم:

پێویستە ئارام بگریت و بزانە گوێڕایەڵیت بۆ مێردەکەت چارەسەر و هۆکاری چوونە بەهەشتە لەهەر دەرگایەکەوە بتەوێت، هەتا مامەڵەو پەیوەندی مێردەکەت چاك بێت، ئەوە وات لێدەکات بەرپەرچی نەدەیتەوە، چەندین فەرموودەی دروست و ساغ و دڵنیا لەبارەی گەورەیی مافی پیاوو وگوێڕایەڵی و پاداشتی گەورە هاتووە بۆ ئافرەتێك فەرمانبەرداری مێردەکەیەتی، بەڵام ئەمەش مانای وانیە لەبەرامبەر ئەم گرفتەدا مل بدەیت و تەسلیم ببین، بەڵکو بەیارمەتی خوا چارەسەری قورس نیە، ئەگەر ئەم هەنگاوانە هەڵبگریت:

١ . هەوڵبدە پەیوەندی بە خوشکەکەت بکە و گفتوگۆی لەگەڵ بکە دەربارەی ئەو گرفتە و ئەگەر بکرێت داوای لێبوردن لە مێردەکەت بکات .

٢ . هەوڵبدە لەکاتی ئارامدا قەناعەت بە مێردەکەت بکە کە راجیاوازی دەربارەی بابەتێك نابێت بکرێتە هۆکاری پچڕاندنی خزمایەتی .

٣ . هەوڵبدە سۆزی مێردەکەشت رابکێشە کە تۆش پێویستت بە بینینی دایکت هەیە ، بەتایبەت کە تۆ خوشکە بچوکیت ، ئەم فەرمودەی خوای گەورەی بیربخەرەوە ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴾ .

هەروەها فەرمان و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر ﷺ بە پەیوەندی خزمایەتی وەك فەرمودەی (لا يَدْخُلُ الجَنَّة قاطِعْ. (اي قاطع رحم)) .

واتە : کەسێك پەیوەندی خزمایەتی ببچڕێنێت ناچێتە بەهەشت .

٤ . ئەگەر ئەمانەش سودی نەبوو ، پەیوەندی بکە بە خوشکەکەت بە تەلەفۆن یان بە نوسینی نامەیەك یان بە ئینتەرنێت ، پێی بڵێ : کە تۆ لە درەختەکە نەبچڕاویت ، پێویستە ئەوان یەکەجار

چارەسەری کێشەکەیان بکەن لەڕێگەی خوشکەکەتەوە، بۆئەوەی گرفتەکە گەورەتر نەبێت.

بەڵام هەتا چارەسەرەکانی تر تاقینەکەیتەوە پەنا بۆ ئەم خاڵە مەبە و پەیوەندی بە خوشکەکەتەوە مەکە، داوا لە خوای گەورە بکە ئەو پەژارەت لەسەر لاببات بە کۆمەك و یارمەتی خۆی، خوا نزیکە و وەڵامی داواکانیش دەداتەوە.

والسلام عليكم و رحمةالله و بركاته



## شەشەم: خەسوم یان دژم؟

" سلاَوی خواتان لیّ بیّت . . .

گرفتی من لەگەڵ خەسوومدایە، هەست دەکەم کە بۆتە بەربەست لە ژیانمدا، من ریّزی دەگرم، بەلاّم هۆکارەکەی میّردەکەمە، کاتیّك هاتە داوام رازی نەبووم، دواتر هەرچۆن بوو رازی بووم، سەرەتا نەمهیّشت ماوەی مانگیّك کاری شەرعی خۆی بکات، خۆشتان ئەوە دەزانن کە چەندە گرفتە، دوای ئەو ماوە بڕیارمدا تەنازول بکەم، بەتایبەت کاتیّك باسی ئەوەی بۆ دەکردم کە رۆژبەڕۆژ خۆشەویستی بۆمن زیاد دەکات، لەدوای ئەوە من زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە هەستم کرد بەکاریّکی گەورە هەڵساوم.

ئەو ساتانەی هەموو ئافرەتیّك خەونی پیّوە دەبینیّت لە بیستنی قسەی رۆمانسی و جوان چاوەڕیّ بووم.

وتم: ئایا وەك پیّشتر وتت خۆشەویستیت بۆمن زیادی کردووە؟

وتی: بەدڵنیاییەوە بەڵیّ، ئەوەندەی تر خۆم لاواندەوە.

وتم: بۆچی؟

وتی: چونکە تۆ دایکمت خۆشدەوێت و هاوکاری دەکەیت.

(خۆمگرت و یادی خوام کرد و کۆتایی هات)، دواى چەند رۆژێك داوای لێکردم پێڵاوی پاژنە بەرز لەپێ نەکەم لە ماڵدا.

وتم: هۆی چیە؟

وتی: چونکە باڵات لەگەڵ دایکم جیاواز دەبێت!! بەکورتی هەست دەکەم دایکی زاڵ بووە بەسەر عەقڵ هۆشیدا، لەهەموو شتێکدا ئەوی دەوێت، وام لێهاتووە کە پێم خۆشە لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا مێردەکەم ببینم نەك لەگەڵ دایکی، چونکە هەست دەکەم دوو عاشقن نەك کوڕ و دایك، هەست دەکەم کە خوێن لە رەگەکانم هەڵدوقوڵێت کە پێکەوە دەیانبینم، لە کاتێکدا هەموومان لە یەك خانودا دەژین، بەڕاستی کەس وەك مێردەکەم مامەڵە لەگەڵ دایکیدا ناکات، مامەڵەی لەئاستی سروشتی دەرچووە، ماوەی حەوت ساڵ بەسەر ژیانی خێزانیماندا تێپەڕیوە ئەم گرفتە چارەسەر نەکراوە، هەر ئەم خاڵەش هۆکاری گرفتەکانمانە لەژیاندا.

بۆتە خەم و خولیام، کردەوە و قسەو هەڵسوکەوتی چاودێری دەکەم، کاتەکان دەژمێرم کە لەگەڵیدا دادەنیشێت، ناتوانم هەستەکانم بشارمەوە، بەشێوەیەك داوای جیابوونەوەم کردووە، چەندین جار چومەتەوە ماڵی خۆمان و بەهەفتە نانم نەخواردووە، هیوام بە گفتوگۆ نیە، من لۆمەی ناکەم، هەست دەکەم هەڵوێستم لاوازە، بەلام ناتوانم بێدەنگ بم، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سوێند بەخوا، سوێند بەخوا، سوێند بەخوا رقم لێی نیە، جگە لە رێز و ئیحترام هیچی ترم لە دڵدا نیە، لەگەڵ ئەوەی خەسووم زوبان شڕە لەگەڵ خۆم و منداڵەکانم، من دەنگم بەسەریدا بەرزنەکردۆتەوە و دەمەدەمێم لەگەڵ نەکردووە، چەندین جار دیاریم بۆ کڕیوە، داوام لە مێردەکەم نەکردووە کە ئازاری دایکی بدات و بێ رێزی بەرامبەر بکات، هەست دەکەم نەخۆش و داخراوم، داوای یارمەتی دەکەم و لەگەڵم رەق مەبن.

ئەمەش کورتەی هەندێك زانیاریە:

١ . لەسەرەتادا بەزۆر شووم پێکرد، دوای ئەوە وەك شێتێك خۆشم ویست، ئێستا زۆر رقم لێیەتی، بەهۆی هەڵوێستەکانی

ئاواتەخوازم کە شووم پێنەکردایە چونکە ئەو ژنی تری هەیە (خێزانەکەیان) .

٢ . مانەوەم لەگەڵیدا تەنها بەهۆی منداڵەکانمانەوەیە .

٣ . پەیوەندیم لەگەڵ کەسوکارم ئاساییە ، هەروەها پەیوەندی براکانیشم بە دایکم ، بۆیە سەرسامم بە پەیوەندی مێردەکەم بەو شێوەیە .

خوایە رازیم بکە بە هاوسەرەکەم و ئەویش رازی بکە بە من ، خوایە وامان لێبکە کە خۆت پێی رازیت و خۆشت دەوێت ، هاوکاریم بکە کە چاکەکاربم لەگەڵ خۆیی و دایکی (یا ارحم الراحمین) " .

## وەڵامی راوێژکار ( د.فیصل سعود ) :

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سوپاس بۆ خوا . . . درووود و سەلام لە پێغەمبەری خوا و ئال و یاران و شوێنکەوتوانی .

خوشکی بەڕێز: سڵاوی خوات لێبێت . .

تەنها دەمەوێت بە دەروونێکی ئارام و دوور لە هەڵەشەیی ئەم چەند دێڕە بخوێنیتەوە، ئەوەی دەربارەی خۆت باست کرد کە (تۆ نەخۆشیت) ئەم قسانە بخەرە لاو دڵت والآ بکە، لاپەڕەیەکی نوێی پڕ لە هیوا و ئومێد هەڵبدەرەوە و ئەو بەربەستە دەروونیە وەهمیە ببڕە بەم شتانە:

بڕوات وابێت کە ئەم بارە دەڕوات و کۆتایی دێت بەیارمەتی خوا.

پرسیار ئەوەیە: ئایا هەموو مامۆستاکانت کە فێریان کردوویت، خۆشەویتیان بۆ تۆ و خۆشەویستی تۆ بۆ ئەوان وەك یەك وابووە؟ رەنگە تۆ بە هەندێکیان زۆر بێتاقەت بوو بیت!! ئەی ئێستا؟ ئەو رۆژانە کۆتاییان هات و غەمەکانی ئەو رۆژانەت بیرچۆتەوە، ئایا وانیە؟ مەبەستم ئەوە نیە کە تۆ رقت لە خەسووتە . . نەخێر . . بەڵکو خۆشت دەوێت، بەلآم کەلەگەڵ مێردەکەت دەیبینیت بەلاتەوە قورسە، ئەمەش قۆناغێکی ژیان زیاتر نیە و تێپەڕ دەبێت، بۆیە هەوڵبدە بیکەیتە یادەوەری جوان بۆخۆت.

بەڵام چۆن سەرنجی رادەکێشیت و دەیخەیتە ریزی خۆتەوە و بەختەوەر دەبن؟

پەیوەندی ئێوە وەك (ژن و مێرد) زۆر جوانە خۆشەویستی و هەستی نێوانتان، تەنها ئەم گرفتەتان هەیە کە لایەکی لەدەرەوەی ئێوەیە، ئەمەش شتێکی باشە کە دەبێت هەستی پێ بکەیت.

ئەی چیت دەکرد ئەگەر مێردەکەت لەگەڵ ئەو پەیوەندیە توندەی لەگەڵ دایکی، کاتێك بگەڕایەوتەوە بە جنێو و سوکایەتی پێکردن و لێدان و هەڕەشە و تۆمەت هەڵبەستن رووبەڕووی تۆ ببوایەتەوە؟ یان دایکی کوڕەکەی دژی تۆ هانبدایە و درۆ و بوختانی بۆ درووست بکردیتایە؟!.

خوشکی رێزدارم... ئەمە روینەداوە، بەڵکو هەست دەکەم غیرە تەها لە ئاستی تۆوەیە و ئەو هەست بەوە ناکات، لێرەدا گرفتەکان زیاتر کورت بۆتەوە و تەنها لەبەردەستی تۆیەو گرفتەکەش ئاسانترە.

با بچینە سەرچارەسەرەکان: بەڵام کاتیشی دەوێت و ئارامگرتنیشی پێویستە.

١ . ئەگەر مێردەکەت گەڕایەوە لەگەڵ دایکیدا، هەوڵبدە هەواڵی دایکی بپرسە بەدڵێکی پاك و بێگەرد و دوور لە تانە و غیرەوە، پاشان دوعای بۆ بکە (خواتەمەنی درێژ بکات و لەش ساغ بێت) لەم قسانە.

هەرچەندە ئەمانە رەنگە لەسەر دەرونت قورس بێت، بەلام هەندێك خوێندنەوە لای مێردەکەت دروست دەکات و هەست بە پاکی دەرونت دەکات و دڵی بۆلای خۆت کەمەند کێش دەکەیت، ئیتر کاتێك لای دایکی گەڕایەوە هەزار حسابت بۆ دەکات و دڵخۆشە بە قسەکانت و چاوەڕێی سەرزەنشت و گلەییەکانت ناکات. هەمیشە بیر دەکاتەوە و دەڵێت: ئەم خێزانەم چەند بەڕێزە، هەواڵی دایکم دەپرسێت وخۆشی دەوێت. . . ئیتر لێرەوە دڵی بەتۆوە پەیوەست دەبێت.

٢ . جوان گوێم بۆ بگرە و ئەم قسەم لێوەربگرە، ئەگەر رۆژێك هاوسەرت نەیتوانی لەگەڵ دایکی دانیشێت لەبەر هەر هۆیەك، وەك سەرقاڵبوونی بەکار یان دەرچوونتان بۆ گەشتێك بۆ دەرەوەی شار، هەوڵ بدە تۆ پێی بڵێی: (پەیوەندی بەدایکتەوە بکە

و هەواڵی بپرسە، چونکە ئەمڕۆ نەتبینیوە و ڕەنگە دڵی لات بێت) بەم شێوەیە دڵی ڕادەکێشیت بەوەی کە ئامۆژگاری دەکەیت لەگەڵ دایکی چاکەکار بێت.

٣. لەدوای بڕینی ئەم قۆناغە و تێپەڕبوونی کاتێك بەسەریدا، قۆناغی دووەم هاوڕێ لەگەڵ قۆناغی یەکەم دەست پێدەکات، کە بریتیە لە بەردەوام بوونت لەسەر چاکە و ڕێزت بۆ دایکی بەهەر شێوەیەك بە گونجاوی دەزانیت، وەك قسەی جوان و بەخشین و دیاری و پەیوەندی پێوەکردنی و سەردانی، ئەمەش ڕێخۆشکردنە بۆ قۆناغی سێیەم.

٤. جارێك لە جاران لەگەڵ هاوسەرت دەربچۆ و خۆت بڕازێنەرەوە، باسی خۆشەویستی خۆتی بۆ بکە و بڵێ: کە دەمەوێت هەمیشە لەگەڵت بم، وەدایکیت خۆشدەوێت، بەلام لەبەر زیادەڕەوی خۆشەویستیت بۆ دایکت خەریکە توشی (غیرە) دەبم، بە هێمنی داوای لێبکە با زۆرێك لە دانیشتنەکانی لەگەڵ دایکیدا لەدووریی تۆ بێت و تایبەتمەندی تۆ بپارێزێت و هەرچی لە نێوانتاندا ڕوودەدات بۆ دایکی باس نەکات، و بڵێ: ئەمانەش

بەیەکجار نەکات بۆ ئەوەی دایکی هەست بە تەنهایی نـەکات، بـە خۆشەویستسەوە پێی بڵـێ: تـۆ کەسـایەتیت هەیـە وتایبەتمەنـدی خۆت هەیە، دایکیشت بەهەمان شـێوە، هەرچـەندە تـۆ خۆشـت دەوێت بەڵام رەچاوی تەمەنی بکە.

٥ . ئینجـا مۆڵـەتی بـدە بـۆ گـۆڕین، مۆڵـەتی بـدە، لـە هەڵوێستەکانی قۆناغی یەکەم و دووەم بەردەوام بە، هەمیشە دوعـا بکە و بڵێ: خوایە وەچەیەکم پێ ببەخشە کە چاکەکار و وەفاداربن لەگەڵ دایـك و باوکیـان وەك وەفـاداری تـۆی خۆشەویـستم ئـەی هاوسەرم بۆ دایکت.

ئیتر ئەمەش وای لێـدەکات هەوڵبـدات خـصوصیەتی دایکـی بپارێزێت و نهێنیەکان بپارێزێت.

٦ . دڵنیا بە تـۆ هاوکـاری مێردەکـەت بکـەیت لەسـەر چـاکە لەگــەڵ دایکــی، تــۆش خــوای گــەورە وەچــە و منــداڵێکت پێدەبەخشێت کە چـاکەکار بـن لەگـەڵتان (و تعـاونوا علـى الـبر و التقوى).

(لەکۆتاییدا) : رابردوو لەبیر بکە و بیری خۆتی مەهێنەرەوە، چونکە ئەوە توشی دارمان و نائومێد بونت دەکات، گرنگ ئەوەیە خۆشەویستی لەنێوانتاندا رەگی داکوتاوە و گوڵی گرتووە، تۆش چاودێری گوڵەکان بکە بە لێزانی و خۆشەویستی، بەراستی لە قسەکانتدا هەستم بە راستگۆیی کرد کاتێك دوعاکانتم خوێندەوە، دەڵێم: خوای گەورە دڵەکانتان پێکەوە گرێ بدات بە راستگۆیی و سۆز و خۆشەویستی و ماڵێکی ئارام و پڕ لە بەزەییتان پێ ببەخشێت، و هیدایەتی هەمووومان بدات لەسەر چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکمان و منداڵەکانیشمان لەگەڵمان چاکەکار بن، خوایە دوعاکانمان وەربگرە.

## حەوتەم: خەسووم دەیەوێت کچەکەم بکاتە موڵکی خۆی؛

"من شوم کردووە و دایکی دوو منداڵم (سوپاس بۆ خوا)، گرفتەکەم دایکی مێردەکەمە. . .

لەو کاتەوە کچەکەم بووە، دەست دەخاتە ناو هەموو شتە تایبەتییەکانی، لە هەڵبژاردنی جل و بەرگ و بردنی بۆلای پزیشك و ئاهەنگ و بۆنە جیاوازەکان، چی دەخوات و چی دەخواتەوە. . . بەشێوەیەك خۆشی دەوێت، زۆر بەخراپی نازی دەداتێ، هەمیشە من تۆمەتبار دەکات بە کەمتەرخەمی بەرامبەری، شەرم رێگەم لێدەگرێت کە بەرپەرچی بدەمەوە چونکە کەسایەتی خەسووم بەهێز و زاڵە.

لەکاتی لەدایك بوونی کچی دووەمم داوای لێکردم کە کچەکەم لەلای ئەو بەجێبهێڵم بۆ ئەوەی چاودێری بکات لەو کاتەدا من دەگەڕێمەوە بۆلای کەسوکارم، منیش رازی بووم، هەر لەو کاتەوە وا دادەنێت کە مافی خۆیەتی کچەکەم بۆ چەند رۆژ ببات بۆلای خۆی، گفتوگۆ قبوڵ ناکات، رەوشتی

کچەکەمی تێکداوە بەهۆی ئەو نازە زۆرەوە، چونکە تەمەنی کچەکەم چوار ساڵە هەر بە باوەش هەڵیدەگرێت، قسە بە نەنکی دەڵێت گوێی ناداتێ، هەرچی داوا بکات بۆی جێبەجێ دەکات، وای لێهاتووە کچەکەم رقی لەمنە چونکە هەوڵ دەدەم هەڵسوکەوتی بگۆڕم، مێردەکەم رۆیشت بۆ کار لە شارێکی تر، بەفرسەتم زانی بۆ راستکردنەوەی کچەکەم، هەرواش بوو، بەرەو چاکی رۆیشت، بەڵام دوای گەڕانەوەمان هەموو شتێك گەڕایەوە بۆ بارەکەی پێشووتر، بەڵکو نەنکی کچەکەم کاتێك هەستی بە هەندێك گۆڕان کرد لە کچەکەمدا، کەوتە هاندانی کچەکەم لەدژی من و بەزۆر قسەی خراپی پێدەکرد.

چی بکەم لەگەڵیدا؟ چۆن رێگەی لێبگرم کە کچەکەم لەگەڵ خۆی نەبات و تەنها لەگەڵ خۆماندا سەردانی بکات؟ ئەمە لەگەڵ ئەوەی مێردەکەم تاکە کەسی دایکێتی " .

## وەڵامی راوێژکار (د. حنان قرقوتی):

تۆ لەگەڵ هاوسەر و کچی یەکەمت بە شێوەیەکی نامۆ دەژین، دەبێت بە مێردەکەت بڵێیت بە نەرم و نیانی و وەك دایکێك پێویست دەکات کچەکەت لێت نزیك بێت، منداڵ لە تەمەنی چوونە قوتابخانەدا پێویستە لەگەڵ خوشکەکەیدا بێت، وریابە لەکاتێکدا گفتوگۆ لەگەڵ مێردەکەتدا بکە کە ئامادە بێت و قسەکانت ببیستێت.

لەگەڵ خەسووتدا کارێکی گونجاوە:

*کچەکەت با هەمیشە هاورێی خوشکەکەی بێت لەکاتی گەرانەوەتان.

*داوا لە خەسووت بکە لە پەروەردەی منداڵەکانتدا هاوکارت بێت نەك دژت بێت.

بەمەش دەتوانیت منداڵەکەت رابکێشیت و پەروەردەی بکەیت لەگەڵ خوشکەکەیدا، هەروەها رەزامەندی مێردەکەشت بەدەست هێناوە، ئاشکراشە رەزامەندی مێرد رەزامەندی خوای گەورەی بەشوێندا دێت.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (ئەگەر ئافرەت پێنج فەرزە نوێژی کرد و مانگی رەمەزان بەڕۆژوو بوو و داوێنی خۆی پاراست لە خراپە، و گوێڕایەڵی مێردەکەی کرد، لە هەر دەرگایەکی بەهەشت دەیەوێت دەڕواتە ژوورەوە).

کچەکەم ئەوەش بزانە کە هەوڵی رەزامەندی خەسووت بدەیت، چونکە دایکی هاوسەرەکەتە و تۆش لەدوارۆژدا دەبیتە (خەسوو).

ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ منداڵی خۆت، لە یادەوەریتتدا هەندێك شتی خۆشت بیر دێتەوە کە لە سۆزی نەنکەوە دروست بووە، تۆش هەوڵ بدە نێوانی خۆت و منداڵەکەت و نەنکی نزیك بخەرەوە.

بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکەشت هەندێك جار وا پێویست دەکات خۆت بخەیتە ئاستی ئەو، رۆڵی دایك تەنها سەرزەنشتکردن نیە لەسەر هەڵەکان، بەڵکو هەندێك جار دەبێت یاری لەگەڵدا بکەیت.

وەك وتەیەك کە دەڵێت: "لەحەوت ساڵیدا یاری لەگەڵدا بکە، لە حەوت ساڵی تردا پەروەردەی بکە، لە حەوت ساڵی تردا ببەرە هاوڕێی" .

حەوت سالّی یەکەم دەبێت نازێکی هاوسەنگ بدرێت بە منداڵ، لە حەوتسالّی دووەم دەبێت منداڵەکەت پەروەردە بکەیت و هەندێك جار لەسەر هەڵە سزای بدەیت، لە حەوت سالّی سێیەمدا دەبێت ببیتە هاوڕێی منداڵەکەت کە منداڵەکەت بەرەو گەنجی دەڕوات، لێرەدا پێویستە گوێ بۆ منداڵەکەت بگریت کە قسە دەکات، با قسەکردنەکەشی لەسەر شتێکی بێهوودە بێت بە بۆچوونی تۆ.

## هەشتەم: خۆگونجان لەگەڵ کەسوکاری مێردەکەم.

سلاّوی خواتان لێبێت.

گرفتی من ئەوەیە زۆر بەلامەوە سەختە کە خۆم لەگەڵ کەسوکاری مێردەکەم بکونجێنم... دایکی مێردەکەم خەڵکی وڵاتی ئێمە نیە و زۆربەی کەسوکاری مێردەکەم خزم و کەسی دایکێتی و کاتێك لەگەڵیان دادەنیشم وا هەست دەکەم لە وڵاتێکی تردام، زۆر یادی کەسوکارم دەکەم، هەرچەندە هەوڵی خۆگونجاندن دەدەم بەلاّم ناتوانم، ئایا ئەوە شتێکی سروشتیە؟

**وەڵامی راوێژکار ( أ. خالد علی الشلیل ):**

سڵاوی خوات لێبێت .

خوشکی رێزدارم . . . خوای گەورە سودمەندت بکات .

بێگومان مرۆڤ هەمیشە بیر لە رابردوو و لە کەسوکارە نزیکەکانی دەکاتەوە، کاتێك لێیان دوور دەکەوێتەوە هەست بە تەنهایی دەکات، هەرچەندە لە ناو مرۆڤگەلێکی وەك خۆیدایە، دەربارەی ئەم هەستەت سەرزەنشتت ناکرێت .

بەڵام دەبێت ئەم هەستە بە تەواوەتی ژیانت داگیر نەکات و بەسەرتدا زاڵ نەبێت، لە قۆناغێکی ژیاندا سروشتیە و هەموو گەشەکردنێك پێویستی بە دابڕان و بەجێهێشتن هەیە، یادگارییەکان دەمێننەوە و بە تێپەڕبوونی کات لەبیردەچنەوە، یان دەبێت لەبیر ببرێنەوە، بەڵام دەبێت خۆشت ئەو هەستە لە خۆت دوور بخەیتەوە، بۆ ئەم مەبەستە بەکورتی چارەسەرەکانت بۆ باس دەکەم :

١ . هەرگیز بە سلبی بیر مەکەرەوە، واتە لەکاتی نارەحەتیدا نامەی نائومێدی ئاراستەی دەروونت مەکە کە ئەمە ناوبراوە بە

گفتوگۆی ناوخۆیی و کاریگەری زۆری لە ژیانتدا هەیە، باهەمیشە هەستت ئیجابی بێت، بەخۆت بڵێ: من دەتوانم خۆم لەگەڵ ئەم خێزانەدا بگونجێنم بەیارمەتی خوا، من بە ویستی خوا بەختەوەر دەبم، ناهێڵم شەیتان فرسەتم لێ بهێنێت و نائومێدم بکات و ژیانم لێ بشێوێنێت، بە زوبان بڵێ من ئەوانم خۆش دەوێت، ئیتر لەگەڵ رۆیشتنی ساتەکان ئەوەی بە زوبان دەرتبڕیوە دەبێتە واقیع لە ژیانتدا.

٢. کاتێك سەردانت دەکەن وریابە بەرپەرچی هاتنیان نەدەیتەوە لەبەر ئەوەی خۆشت ناوێن، بەڵکو زۆربەگەرمی پێشوازییان بکە و میوانداریيان بکە.

٣. لەکاتی دانیشتن لەگەڵیاندا کراوە و قسەخۆش بە، بێدەنگ و خامۆش و دوور لە کۆڕەکە مەبە.

٤. هەوڵبدە بە چەند شێوازێك سەرنجیان رابکێشیت، بچۆرە دڵەکانیان ئەوەش زۆر ئاسانە، دیاری ببەخشە بە منداڵەکانیان و لە چێشتخانەدا یارمەتییان بدە، یارمەتی خوێندنیان بدە.

٥. بەنهێنی دوعایان بۆ بکە، ئەوەش خۆشەویستی نێوانتان زیاد دەکات.

٦ . بەوشیوەیە مەبە کە هەرچی کردەوە و گوفتاری ئەوانە لێکدانەوەی خراپی بۆ بکەیت .

لە کۆتاییدا دەڵێم :

ئەگەر بەڕاستی هاوسەرەکەت خۆشدەوێت، کەسوکارەکەیشت خۆش بوێت .

غەم و پەژارەکانت بۆ لای خوا بەرز بکەرەوە، خوای گەورە پەژارەت لادەبات، بەتایبەت لە کاتی سوژدەدا، ئیتر بە یارمەتی خوا وەڵامگۆی داواکانت دەبێت .

## نۆیەم: ژنەکەم دوژمنایەتی لەگەڵ کەسوکارم دەکات.

" سڵاوی خواتان لێبێت. . .

من گەنجێکی دیندارم (سوپاس بۆ خوا) ماوەی شەش مانگە ژنم هێناوە، زۆر بێتاقەتم بەهۆی ئەوەی خێزانەکەم قسە بە کەسوکارم دەڵێت، بە تایبەتی بە دایکم، بەبێ بوونی هیچ هۆکارێك، هەمیشە هانم دەدات کە چاك نەبم لەگەڵیان و سەردانیان نەکەم، دەیەوێت تەنها بۆ ئەو بم، چەندین جار هەوڵم داوە بۆچوونی راست بکەمەوە، چەندین شێوازم بەکارهێناوە، بەتوندی، بەنەرمی، بە هەڕەشەی جیابوونەوە، بەڵام سروشتی ناگۆڕێت،لەلای دایك و باوکی سکالاّم کردووە ئەویش سودی نەبووە،هەرچەندە ئەوانیش پشتی منیان گرتووە، بەڵام ئەو ئامۆژگاری قبوڵ ناکات، بۆ زانیاریش ژنەکەم لەرووی دینداریەوە لاوازە، بەو شێوازە نییە کە پێش خواستنی بوو، نوێژەکانی لەکاتی خۆی ناکات و بەرگ و پۆشاکی موسڵمانیناپۆشێت هەرچەندە فەرمانم پێکردووە، ئەو کەسێکی توندو رەقە، بێزار بووم و بیر لە

جیابوونەوە دەکەمەوە، بەڵام دەترسم ستەمی لێبکەم، چونکە منی زۆر خۆشدەوێت ونایەوێت لیّ ی جیاببمەوە، دەگری و منیش سۆزم دەجولێت بەرامبەری، بەڵام دەترسم بەهۆی ئەوەوە دینم لاواز بێت و خراپە لەگەڵ دایك و باوکم بکەم، ئەم باسەم لەگەڵ کەسوکارم نەکردۆتەوە، ئەوانیش هەرچەندە بێزاریی من دەبینن بەڵام بێدەنگییان هەڵبژاردووە، لە نوێژەکانمدا دوعای زۆر دەکەم، بە تاقیکردنەوەی خوای دەزانم و ئارام دەگرم، بەڵام چیتر توانام نەماوە لەگەڵ ئافرەتێك بژیم کە دیندار نیە و رقی لە کەسوکار و خێزانەکەم و رێگەی چاکەکردنم لێدەگرێت لەگەڵیان و هەمیشە بەرامبەریان سنور دەبەزێنێت و هەستی من راناگرێت، لەوەش دەترسم منداڵمان ببێت و کارەکان زۆرتر ناخۆش ببن.

ئامۆژگاریم بکەن خوای گەورە پاداشتان بداتەوە، ئایا ئەگەر لێی جیا ببمەوە تاوانبارم؟ " .

**وەڵامی راوێژکار (أ. عبدالسلام صالح):**

برای بەرێزم: داواکارم خوا یارمەتیت بدات بۆ چاکەکاری لەگەڵ دایك و باوکت.

بەراستی تۆ لە دووڕیانێکدایت. . .

یان ئەو هاوسەرە ئایین لاوازە واز لێدەهێنیت کە خراپە لەگەڵ کەسوکارت، بەتایبەت کە ماوەی خێزانداریتان زۆ نیە (شەش مانگ) و هەوڵیش دەدات کە واز لە چاکەکاری بهێنیت لەگەڵ دایك و باوکت، ئەوەش کارێکی زۆر ترسناکە.

رەنگە ئێستا ئارام بگریت، بەڵام ئایا دواتر دەتوانیت؟

هەندێك جار ئافرەتی دیندار بە مەبەست یان بێ مەبەست مێردەکەی سەرقاڵ دەکات کە نەتوانێت بە چاکەکردن لەگەڵ کەسوکاری هەڵسێت، جا ئەگەر ئافرەت دیندار نەبێت و بەئەنقەست ئەو کارە بکات، لەکاتێکدا دایك و باوکت تەمەنی لاوی خۆیان بۆتۆ سەرف کردووە، ئایا دەبێت پاداشتیان بەو شێوەیە بێت؟

یان ڕێگەیەکی تر هەڵدەبژێریت و ئامۆژگاری چاکی دەکەیت و لەماڵ بەجێی دەهێڵیت و جێگەی لەگەڵ جیا دەکەیتەوە هەرکاتێك قسەی بە دایکت وت، بەڵام دەبێت ئەم هەڵسوکەوتەت زۆر بە جدی بێت و کەمتەرخەم نەبیت، ئەگەر سودت لەم شێوازە وەرگرت ئەوە باشە، ئەگەر نا واز لە هاوسەرەکەت بهێنە و خەفەتی لێ مەخۆ، چونکە چاکەکاری لەگەڵ دایك و باوك و خێزانەکەت لەپێشترە، کە ڕێز و حورمەت بۆ ئەوان دانەنێت و هاوکاریت نەکات بۆ چاکەکردن لەگەڵیاندا، و ڕێزیش بۆ ئامۆژگاریەکانی دایك و باوکی خۆی دانەنێت، ئەوە دەبێت هەڵوێستت هەبێت؟

بەڵام پێویستە هەموو ڕێگەکان بۆ چارەسەرکردن بەکار بهێنیت، ئەگەر هەستت بە گۆڕانی کرد ئەوە زۆر باشە، ئەگەر گۆڕانت نەبینی ئەوە بزانە هەرکەس لەبەر خوا واز لە شتێك بهێنێت، خوای گەورە باشتری پێ دەبەخشێت، خۆشەویستی بۆتۆ هیچ بەڵگە نیە کە قبوڵی بکەیت و پێی ڕازی بیت.

## دەیەم: دایك و باوكم قسە بە ژنەكەم دەڵێن.

"ژنم هێنا و كوڕێكمان بوو لەگەڵ كچێك، بەڵام هەمیشە ڕووبەڕووی گاڵتە پێكردن دەبمەوە لەلایەن خەڵكەوە و پێم دەڵێن: ئەو ئافرەتە خراپەت خواستوە، سەرسام بووم بە بیستنی ئەم قسەیە. . . دوایی زانیم كە دایكم ئەم قسەیەی دروست كردووە و بەناو گوندەكەماندا بلاوی كردۆتەوە و تۆمەتی هەڵبەستووە و ئەو درۆ و بوختانەی ساز كردووە، جارێك پێی وتم: ئەو شەوەی چویتە لای هاوسەرەكەت ئەو تۆی هەڵخەڵەتاندووە و خوێنەكەی خوێنی (حەیز) بووە نەك خوێنی كچێنی، كەوتمە ناو گومان بەرامبەر ژنەكەم، لە سەرەتای ژیانی بوك و زاوایەتیمان هەمیشە بیرم لێدەكردەوە و ئەمەشم بۆ ژنەكەم باس كرد، بەڵام ئەو قەناعەتی پێكردم و وتی: ئایا گومانت لە پاكی من هەیە؟ بەقسەی هەڵبەستراوی دایكت؟ ئیتر لەوكاتەوە رقم لە دایكمە و بیریش لە تەڵاقدانی ژنەكەم دەكەمەوە، بەڵام لەدڵی خۆمدا دەڵێم: من گوناهێكی گەورە دەكەم ئەگەر بەبێ تاوان ئەو كارەی لەگەڵ بكەم.

داوای چارەسەرێكی گونجاو دەكەم بۆ ئەو گرفتەی ماوەی پێنج ساڵە گیرۆدەم بە دەستیەوە. چی بكەم؟".

## وەڵامی راوێژکار ( د.علی عبدالرحمن الرومی ):

سوپاس بۆ خوا، سەلام و دروود لەسەر گەورەی پێغەمبەران و ئال و یاران و هاوەڵانی بە گشتی . .

داواکارم لە خوای باڵادەست نێوانتان لەگەڵ هاوسەر و دایکت ساز بکات و لە شەیتان و وەسوەسەکانی بتانپارێزێت و لەسەر خێر و چاکە کۆتان بکاتەوە .

برای بەڕێزم :

یەکەم: گرفتەکە وەك باست کرد لەلایەن دایکتەوەیە، چونکە ئەو هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە و باوکیشت لۆمەت دەکات، ژنەکەت وەك خۆت دەڵێت تاوانی نیە، ئەو کچ بووە و فێڵی لە تۆ نەکردووە وەك ئەوان گومان دەبەن، کاتێك توشی راڕایی بویت ئەو باسی ئەو شەوەی کردووە و قەناعەتی پێ کردویت .

کەواتە گرفتەکە لەلایەن دایك و باوکتەوەیە، بۆیە پێویستە هەوڵ بدەیت باوەڕیان پێ بکەیت کە واز لەو تۆمەت و درۆیانە بهێنن و لە مەترسی ئەو قسانە ئاگاداریان بکەیتەوە، ئەگەر لە

دونیاش سزاکەی وەرنەگرن، قیامەت چاوەڕێیان دەکات، ئینجا باسی ئەوەیان بۆ بکە کە ئەگەر منداڵەکانیان ئەو قسانە ببیستن کاریگەری خراپی لەسەر کەسایەتیتان دەبێت و دەرونیان پڕ لە رق و کینە دەبێت بەرامبەر لایەکتان.

دووەم: هەرچەندە بەجوانی باسی گرفتەکەت کردووە، بەلام هەندێك شت پێویست بوو بۆ زیاتر تێگەیشتن لەو گرفتە، بۆ نمونە: ئایا کەی دایك و باوکت بەو شێوەیە قسەیان بەرامبەر ژنەکەت کردووە؟ ئایا لەسەرەتادا رازی بوون بەو ژن هێنانەت؟ چی وای لێکردوون ئەو تۆمەتە دروست بکەن؟ ئایا ئەوە پەیوەندی بە هەڵسوکەتی خێزانەکەتەوە هەیە؟ ئایا خێزانەکەت کارێکی وای کردووە جێگەی گومان بێت؟ یان تەنها ملمانێی نێوانیانە و هیچ پەیوەندی بە هەڵسوکەوتی خێزانتەوە نیە؟ . . .

لە وەلامی ئەم پرسیارانە دەتوانیت زیاتر لە گرفتەکە تێبگەیت کە ئایا رۆڵی دایك و باوکتە. یان رۆڵی خێزانەکەتە؟ ئەو کاتە دەتوانیت بەشە لێپرسراوی هەرلایەکیان دیاری بکەیت بە مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەکەت.

سێیەم: پاشان بزانە ڕۆڵی تۆ چیە؟ کە زۆر گرنگە ئایا لاوازی کەسێتی و گومان و ڕاڕاییت لە هەڵوێست وەرگرتنێکی دروست، بۆتە هۆی گەورەبوونی کێشەکە؟ لەڕوانگەی گرفتەکەوە شێوازی چارەسەرەکان دیاری بکە و لایەنی چاك و خراپی شێوازەکان دەستنیشان بکە و بزانە کامیان هەڵبژێریت گونجاوە، یان زیانی کەمترە.

چوارەم: لەخوا بترسە، ستەم مەکە، چونکە ستەم مایەی تاریکی قیامەتە، تۆ باست کرد ئەو قسانەی دەربارەی هاوسەرەکەت کراوە بوهتانە، درۆیە، هەڵبەستراوە، ئەگەر وایە ستەمە گومانت لە ژنەکەت هەبێت، لەبیرت نەچێت ئەسلْ وایە کە ئەو بەریئەو وبێتاوانە، ئەمەش مەگەر بە بەڵگە لابچێت، لەبیرت نەچێت کە پاکترین ئافرەت تۆمەتی بۆ هەڵبەستراوە، بەڵام ئەو پلە و ڕێزی زیادی کردووە و قورئانیش ئایەتی پاکی و خاوێنی دەربارەی ناردووە. . . .

لە کۆتاییدا:

دوعای زۆر بکە خوای گەورە غەم و پەژارەت لا ببات و هاوسەر و منداڵەکانت و دایك و باوکت چاك بکات و لە زوبانی خەڵك دوور بن.

**یانزەیەم: هاوسەرەکەم و سەردانی رۆژانەی بۆ ماڵی دایکی.**

" سلاوی خواتان لیّ بیّت . . .

خەسووم (دایکی ژنەکەم) ژنەکەم ناچار دەکات کە هەموو رۆژێك سەردانی بکات، لەگەڵ ئەوەی رۆژێکی دیاریکراوم دیاری کردووە کە برِواتەوە بۆ ماڵی خۆیان، رۆژێك لە هەفتەیەکدا دەچین و دەمێنینەوە و رۆژ تا دوانزەی شەو، بەلاّم هەندێك جار هەست بە گوناهباری دەکەم، چونکە دایکی بەتەنهایە و هەموو منداڵەکان لە دەرەوەی ماڵن (کورِ و پیاو) هەتا کە ئێمەش دەچین زۆر کەم رێکدەکەوێت لەگەڵ برای ژنەکەم دابنیشین، من زۆر حەز دەکەم لە ماڵی خۆماندا لەگەڵ کەسوکارم بمێنمەوە چونکە تاقانەم، بەلاّم بە زۆری پەیوەندیەکانی خەسووم بێزار دەبم کە داوا دەکات کچەکەی بێت بۆلای چونکە بێتاقەتە، دایکیشم گلەییم لیّ دەکات، لە کاتێکدا خوشکەکانم رۆژانە سەردانی دایکم دەکەن " .

**وەڵامی راوێژکار ( أ عبدالسلام صالح ):**

برای بەڕێزم :

دەربارەی ئەوەی کە باست کرد، باوەڕم وایە کە تۆ لەبەردەم دوو پێشنیاردایت :

**یەکەم:** چاوەڕێی پاداشت بکەیت و رەچاوی باری دایکی هاوسەرت بکەیت، کە تەنها کچێکی هەیە و یادگاری زۆری لەگەڵدا هەیە پێش شوو کردنی، بەتایبەت کە ئەو کچی تری نییە، جا ئەگەر مۆڵەتی هاوسەرت بدەیت کە سەردانی بکات، کە ئەوەش بۆتۆ نارەحەتە، ئەو چارەسەر گونجاوە، تا خۆشەویستی و سۆزی هاوسەرت بەدەست بهێنیت، بە تایبەت کە تەنهایی نابێتە گرفت بۆتۆ، بۆیە دەگونجێت مۆڵەتی هاوسەرت بدەیت کە هەرکات ویستی سەردانی دایکی بکات، بەڵام تۆ بەپێی گونجان سەردانی بکەیت.

**دووەم:** لە خۆتەوە دەست پێ بکەیت و داوای لێبوردن لە خەسووت بکەیت بە شێوازێکی ناسك و جوان باسی

سەرقاڵییەکانتی بۆ بکەیت، پاشان وردە وردە ڕۆشتنی خێزانەکەشت کەم بکەیتەوە، بەڵام کاتە دیاریکراوەکان بەیەکەوە هەر سەردان بکەن لە هەفتەدا، ئینجا لەو کاتانەدا با خێزانت پەیوەندی بە دایکیەوە بکات کە نەیتوانیوە بڕوات بۆلای، هەوڵ بدەن دایکی بە کارێکەوە سەرقاڵ بکەن، وەك: لەبەرکردنی قورئان و خێر و چاکەکردن و ئامادەبوونی دەرس و چالاکی بانگخوازی. . . هتد. .

هەموو ئەمانە داوای خەسوت کەم دەکاتەوە لە چوونی ئێوە بۆلای.

هیوای سەرکەوتن و ژیانێکی ئارامت بۆ دەخوازم.

**دوانزەیەم: من گومانم هەیە لە خزمەتکردن بە خەسووم.**

گرفتەکە بەکورتی ئەمەیە:

ئافرەتێك کە شووی کردووە و ماوەی هەشت ساڵە خاوەنی سێ منداڵە، خەسووی لەگەڵیاندا دەژی و پەیوەندییان باشە، خەسوو (بوکەکە)ی بە کچی خۆی دەزانێت و ئەویش خەسووی بە دایکی دووەمی سەیر دەکات، بەڵام خەسووەکە توشی شکانی دەستی بووە و بەیارمەتی کەسێك نەبێت ناتوانێت بجوڵێت و تەمەنیشی هەشتا ساڵ دەبێت، ئەم ئافرەتەش نازانێت چی بکات و چۆن هاوسەنگی لە نێوان داوای منداڵەکانی و داواکاری خەسووی رابگرێت، لەکاتێکدا خەسووی کچێکی بێوەژنی هەیە کە لە شوقەیەکی تردا دەژی و ئەتوانێت خزمەتی دایکی بکات، بەڵام ئەو نایەوێت بچێت بۆلای کچەکەی و سورە لەسەر مانەوەی لای کوڕەکەی، چونکە ئەو شوقەیەی کوڕەکەی تیایدا دەژی هی ئەوە.

ئەو بوکە چی بکات لەم ئافرەتە بەتەمەنە؟ لەگەڵ ئەوەی زۆر قورسە لەیەك کاتدا خزمەتی ئەو و خزمەتی منداڵەکانیشی بکات.

چارەسەر چیە؟.

**وەڵامی راوێژکار( شیخ عادل سعد النحو ):**

سوپاس بۆ خوای گەورەو وسەلام لەسەر پێغەمبەری ئەمین و ئال و یارانی.

دواکارم خوای بەدیهێنەر و رۆزیدەر و زیندوکەرەوەی ئێسکەکان، دڵت زیندوو بکاتەوە و رێزت زیاد بکات و پاداشتت بۆ بنوسێت و باوەڕت زیاد و رۆزیت زۆر و بەرچاورۆشنت بکات.

خوشکم: مامۆستایەکی زانکۆ خوای گەورە توشی نەخۆشیەکی دڵی دەکات، بۆیە پێش عەمەلیاتەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەواڵپرسینی کەسوکاری لە میصر، کاتێك لە نوسینگەی هاوەڵێکی دەبێت ئافرەتێکی هەژار دەبینێت کە پاشماوەی ئێسقان و گۆشتی دوکاندارێك هەڵدەگرێتەوە کە گۆشت دەفرۆشێت.

ئەم دیمەنە سەرنجی رادەکێشێت و دەچێت بۆلای ئافرەتەکە و دەڵێت: چی دەکەیت؟ دەڵێت: هەندێك گۆشت و ئێسقان بۆ کچەکانم کۆدەکەمەوە، سوێند بەخوا ماوەی شەش مانگە گۆشتیان نەخواردووە!!. کابرا زۆر دڵگران و بێتاقەت دەبێت و دەست دەکات بە گریان، بە کابرای گۆشتفرۆش دەڵێت: براکەم

هەرکات ئەم ئافرەتە هات هەموو هەفتەیەك چەند گۆشتی پێویستە بیدەریێ لەسەر حسابی من.

ئینجا پارەی ساڵێکی گۆشتی دەداتیێ، ئافرەتەکە زۆر دڵخۆش دەبێت و سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە و داوای ئاسودەیی و بەختەوەری و سەلامەتی لەخوا دەکات بۆ ئەو پیاوەی کە ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردووە، پیاوەکە دەگەڕێتەوە ماڵ و زۆر دڵخۆش و شادومانە، کچەکەی بەرەو پیری دەچێت و دەڵێت: باوکە زۆر رووت گەشە و دڵخۆش دێیتە بەر چاوم!. باوکی باسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە... ئەویش سەری بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەڵێت: داواکارم لەخوا بە شیفای نەخۆشیەکەت بەختەوەرت بکات، وەك چۆن دڵی ئەو ئافرەتە و منداڵەکانیت خۆش کرد.

پاش چەند رۆژێك پیاوەکە هەست بە چاکبونێکی سەیر دەکات، کەسوکاری داوای لێدەکەن سەردانی نەخۆشخانە بکات، لەوکاتەدا لەبەردەستی پزیشکەکاندا پشکنینی بۆ دەکرێت،

پزیشکەکە هاوار دەکات: لای چ پزیشکێك چارەسەرت وەرگرتووە؟! بەراستی نەخۆشیەکەت نەماوە!.

مامۆستا دەست دەکات بە گریان و دڵێت: من بازرگانیم لەگەڵ خوا کرد و خواش شیفای پێ بەخشیم.

جا خوشکی بەڕێزم داوات لێدەکەم تۆش لەگەڵ خوادا بازرگانی بکەیت، زاتێك کە خەزێنەی ئاسمان و زەوی لەبەردەستدایە، ئەوزاتە دەتوانێت بەرەکەت بخاتە ژیانت بەرامبەر چاکەکردنت لەگەڵ دایکی مێردەکەت کە کەوتۆتە تەمەنەوە.

دەزانم ئەرکت زۆرە و کارت هەیە، بەڵام متمانەم بە باوەڕت هەیە، دەزانیت کە ئەوە دەرگای خێر و چاکەیە و خوای گەورە هێناویێتی بۆ بەردەستی تۆ؟ کە تۆ لەگەڵ ئەو ئافرەتە بەتەمەنە چاکەکار بیت و لەهەمان کاتدا چاودێری منداڵەکانت بکەیت، ئەمەش ئەرکێکی ئەستەم نیە و ئیبن قەییم دەڵێت: "ئەگەر پیاوێك لەبەردەم شاخێکدا بوەستێت و بڕیار بدات لەبنی بهێنێت، دەتوانێت".

لەدوای لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە کە ئەستەم لە ژیاندا نیە جگە لە دوو شت نەبێت :

١ . ئەستەمێکی گەردونی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِي بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَ﴾ البقرة: ٢٥٨ .

٢ . ئەستەمێکی شەرعی، کە بڕیاری کۆتایی لەسەر دراوە و ناکرێت بگۆڕدرێت، بۆ نمونە ئەستەمە نوێژی شێوان بکرێت بەدوو رکات، یان حەج لەوادەی دیاریکراوی خۆی دوا بخرێت .

خوشکم ئینجا بڕوانە بۆ ئەم چەند خاڵە :

١ . تێڕوانینت بۆ خەسووت وابێت کە ئەو یارمەتی تۆ دەدات نەك بە پێچەوانەوە، لەو وشانەی ئیبن قەییم بڕوانە کە دەڵێت: "باشترین کەس کەسێکە وات لێ بکات چاکە بکەیت بەرامبەری، ئەوە باشترین یارمەتیدەرە بەروە کەماڵ چوونی تۆ، چونکە کاتێك سودی پێدەگەیەنیت، تۆش سود لەو وەردەگریت بەڵکو زیاتریش، خراپترین و زیانبەخشترین کەس کەسێکە وات

لێبکات کە سەرپێچی خوا بکەیت، ئەوە یارمەتیت دەدات بۆ زیان گەیاندن بە تۆ و بەرەو کەم و کوڕی چوون" . الفوائد: ص٢١٣ .

٢ . ئەو پێداویستیە کاتیە و دەڕوات لە کاتێکی کەمدا .

٣ . دڵنیابە کە یارمەتیدانی تۆ بۆ خەسووت دەبێتە مایەی بەرز و بەڕێزی تۆ لای هاوسەرت .

٤ . کەس داوای ئەوەت لێناکات کە بەتەواوی خزمەتی خەسووت بکەیت، چونکە هەموو ئەوانەی دەوروبەرت دەزانن کەتۆ ئەرکی ترت هەیە کە دەبێت پێی هەڵبستیت .

ئەلیکسیس کاریل دەڵێت: پێویستە بزانین هەوڵدان بۆ بەخشین هەرچەندە ئاوێتە بێت، یان لە هەندێك رووەوە سەرکەوتوو نەبین، باشترە لەوەی کە هەر هیچ نەکەین و هەوڵ نەدەین .

٥ . ئاماژە دەروونیەکان کاریگەریان هەیە، دکتۆر (عبدالعزیز القوصی) لە پەڕاوی (اسس الصحة النفسیة) چیرۆکێك دەگێڕێتەوە کە: "یەکێك لە توشبوان بە نەخۆشی (ڕەبو – تەنگەنەفەسی) شەوێك توشی تەنگە نەفەسی دەبێت و دەیەوێت هەوای پاك هەڵمژێت، هەڵدەستێت دەگەڕێت بۆ سویچی

گلۆپ، نایدۆزێتەوە، ئینجا بەرەو پەنجەرە دەڕوات، دەستی بەر شوشەیەکی سارد دەکەوێت، دەیەوێت بیکاتەوە بەلام ناتوانێت، پارچەیەك قوماش لە دەستی دەئاڵێنێت و شوشەکە دەشکێنێت، بەقوڵی هەناسە دەدات بۆ هەڵمژینی هەوای پاکی دەرەوە.. بەیانی کە هەڵدەستێت دەبینێت پەنجەرەکە ساغە و نەشکاوە، بەڵکو ئەو شوشەیە شوشەی سەعاتەکە بووە، ئەو خەیاڵ و وەهمە کە وایزانیوە شوشەی پەنجەرەکەیە و شکاوە و هەوای پاکی بۆ هاتووە، کاریگەری لەسەر تەنگە نەفەسیەکەی کردووە و باش بووە" .

ئێمەش هەرکات هەستمان کرد چاکین و بەتواناین، ئیتر گرفتەکان وەك هەورێك دێنە بەرچاومان و دڵنیا دەبین کە دەڕەوێنەوە، خەڵکی تر لە کێشەی زۆر زیاتر و گەورەتردا توانیویانە سەرکەوتوبن، کەواتە گەشبین بە و قەناعەت بە خۆت بکە کە دەتوانیت ئەو کارە بکەیت و تێپەڕ دەبێت و دەرونت ئاسودە دەکات.

کەواتە گەشبینبە بە خێر پێی دەگەیت و دەیدۆزیتەوە.

٦. سەیری ئەوە مەکە کە خەسووت کچێکی هەیە، مادەم لەگەڵ تۆیە و تۆش لە خانووی ئەودایت، ئەو چاکەیەت لەبیر

نەچێت و چاکەی لەگەڵ بکە، بە ویستی خۆت دڵخۆشی و شادی خزمەتی بکە و چاوەڕێی پاداشتی خوای بالآدەست بە.

٧. بەو شێوەیە بە کە حەز دەکەیت ببیت. . باوکێك دەگێڕێتەوە کە پێش (٥٠ ساڵ) لەگەڵ دایکی دەچێت بۆ حەج، لەگەڵ قافڵەیەك کە بە وشتر دەڕۆن، لەرێگە باوك دەیەوێت دابەزێت و سەرئاو بکات، کوڕەکەی دایدەگرێت، باوکی دەڵێت: تۆ لەگەڵ کاروانەکەدا بڕۆ، منیش پێتان دەگەمەوە، پاش ماوەیەك کوڕەکە ئاوڕدەداتەوە، باوکی نابینێت و کاروانەکەش دوورکەوتۆتەوە، دەگەڕێتەوە و دابەکۆڵ باوکی هەڵدەگرێت، کوڕەکە دەڵێت: دەرۆیشتسن، هەستم کرد تەڕی دەکەوێتە سەر روومەتم، بۆم دەرکەوت گریانی باوکمە، وتم: باوکە سوێند بەخوا ئەوەندە سوکیت لەسەر شانم وائەزانم پوشێکیت و هیچ ماندوو نابم، ئیتر بۆ دەگریت؟! وتی: کوڕم بۆ ئەوە ناگریم، بەلآم لەم شوێنەدا منیش باوکی خۆمم کۆڵ کردووە. . . الله اکبر. . .

حەز دەکەیت چۆن بن بۆت تۆش ئاوابە بۆ خەڵك.

لە کۆتاییدا ئومێدی ئاسودەیی دنیا و بەختەوەری قیامەتت بۆ دەخوازم.

## سیانزەیەم: ئافرەتێك و خەزوی لە خێزانێکدا.

ئافرەتێکی بەڕێز لە گەڕەکێکدا باسی خۆی دەکات کە ماوەی سیانزە ساڵە شوی کردووە، مێردەکەی لە ژنێکی تر سێ کوڕی بووە، گەورەکەیان پێنج ساڵان بووە، و بچوکەکەیان دووساڵان، ئەویش لەو پیاوە سێ کوڕی هەبووە، کەواتە لەگەڵ شەش کوڕ و باوکیان کە (هاوسەری ئەوە) دەژی.

دەگێڕێتەوە کە هەرگیز جیاوازی لە نێوان کوڕەکاندا نەکردووە لە هیچ شتێکدا، کوڕەکان ئێستا هەموویان خەریکە لە زانکۆ و پەیمانگا و دواناوەندیدا دەردەچن، بەڵام سکاڵا لەدەستی خەسووی دەکات، کە ئافرەتێکی داخراوە و هەمیشە پێویستی بە خزمەتکردن هەیە، کوڕەکەی هێناویتی بۆ ئەوەی ماوەیەك لەگەڵیان بژی.

ئەو خەسووە چوارکوڕی هەیە، جگە لە مێردی ئەو ئافرەتەی پرسیارەکان دەکات، لە ماوەی مانگێکدا کە لە لای ئێمەیە هەمیشە دوعامان لێدەکات، تا بوکەکەی نەخۆش دەکەوێت و پزیشك داوا

دەکات ئەو شتانەی دەبنە هۆی تورەیی و بێزاری و دڵەڕاوکێ لێی دوور بخرێتەوە. لێرەدا کوڕەکە (مێردەکەی) دایکی دەبات بۆماڵی برایەکی تریان، بەڵام ئەو هەر بەردەوامە لەسەر دوعاکانی و هەمیشە هانی کوڕەکان دەدات کە بەبێ فەرمانی دایکیان بکەن، پرسیار دەکات چۆن لە شەڕی دوعاکانی خۆی بپارێزێت؟ ئایا ئەو خەسووەی مرد و لەو خۆش نەبوو، ئایا زیانی دوعاکانی پێدەگات؟

**وەڵام:**

ئەگەر ئەو خوشکە راست بکات لەو قسانەیدا کە بەجوانی مامەڵەی لەگەڵ منداڵی مێردەکەیدا کردووە و جیاوازی لە نێوان کوڕەکانی خۆی و کوڕی دایکەکەی تر ناکات و راستیش بکات کە خەسووی ئاوا دوعا دەکات و توشی شەلەل بووە، ئەوە قەیدی نیە و تاوانبار نیە ئەگەر زۆری بۆ هاتبێت، بەهەر حاڵ: نابێت بێئارام بێت لەگەڵیدا و هەرچەندە دەتوانێت خزمەتی بکات، ئەگەر ئەویش زۆری بۆ هاتبێت، ئەوا پێوستە لەگەڵ کەسوکاری کە

پەیوەندی نزیکی و خزمایەتیان لەگەڵ ئـەو ئافرەتـەدا هەیـە دەبێـت خزمەتی بکـەن، دەربـارەی دوعاکـانی، دەبێـت ئـەو ئافرەتـە کـە پرسیاری کردووە دڵفراوان بێت و لێی خۆش بێـت، لێـرەدا حـەق لای بوکەکەیە، نەك لای خەسوو، هەرچەندە هـەموو کوڕەکـانی لە ژیانیدا ماون.

لە پێغەمبەر ﷺ ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: (**علموا من انسابكم ما تصلون به ارحامكم، فإن صلة الرّحم محبة في الاهل، مثراة في المال، منسأة في الأثر**) الترمذي.

هەروەها دەفەرموێت: "هیچ گوناهێك شایستەتر نیە کە خوا تۆڵەی لە دونیادا پێش بخـات، لەگـەڵ بـوونی تۆڵـەی قیامـەت لـە وێنەی ستەم و پچڕاندنی خزمایەتی" ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتەوە.

ئەوەتا پـچڕاندنی پەیوەنـدی خزمایـەتی لەگـەڵ سـتەمکاریدا داناوە و هەردوکیان خوا تۆڵەیان لە دونیادا پێش دەخات.

کەواتە ئەم خوشکە بەڕێزەی پرسـیاری کـردووە، نابێـت بـە بەهانەی ئەوەی کـە خەسـووی دوعـای لێ دەکـات و منداڵـەکانی لەدژی هاندەدات پەیوەندی لەگەڵ بپـچڕێنێت، پێویـستە بەرامبـەر

خەسووی رقەکانی بخواتە و لێبووردنی هەبێت تا بچێتە ریزی چاکەکارانێك کە خوا ستایشیان دەکات.

﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ آل عمران: ١٣٤.

هەروەها دەبێت ئارام بگرێت لە بەرامبەر ئەو ئازار و نارەحەتیانەی لە لایەن خەسوویەوە توشی دەبێت، ئەوکاتە بەراستی خوای پەرستووە.

لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: هیچ کەس بە ئەندازەی خوا بەرامبەر بەندەکانی ئارامگر نیە، هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن، کوڕی بۆ بڕیار دەدەن... لەگەڵ ئەوەشدا رۆزییان دەدات و شیفایان دەدات، لەگەڵ ئەوەی ئەوان بەرامبەر خوا بێ ئەدەبی دەکەن، خوا پێیان دەبەخشێت و هۆکارەکانی ژیانیان بۆ فەراهەم دەهێنێت.

بێگومان چاکەکردن بە رۆیشتنی کات شوێنەوای دەردەکەوێت و پەیوەندی خەڵك پێکەوە دەگونجێنێت.

داوا لەو خوشکە دەکەم واز لە سکالاّ بهێنێت بەرامبەر خەسووی، لاپەڕەیەکی نویٚ و تازە لە پەیوەندی نێوانیان هەڵبداتەوە، کە پەڕەی لێبوردن و ڕێزگرتن و چاکەکردن و چاودێری کردن بێت، خراپە بە خراپە چارە نەکات، مادەم بەلاتانەوە ئاسان بێت لەگەڵ هاوسەرت چاك بیت، دەبێت بەلاشتەوە ئاسان بێت توڕەیی خۆت بشاریتەوە و لێبوردن و سینەفراوانی بکەیتە سیمات، ئەوکاتە بە چاوی خۆت ژیانێکی ئارام هەست پێدەکەیت.

## چواردەیەم: کەسوکارم دەیانەوێت خێزانم تەڵاق بدەم.

ئەگەر باوکێك فەرمانی بە کوڕەکەی کرد کە هاوسەرەکەی تەڵاق بدات، ئایا پێویستە بەگوێی بکات؟

**وەڵام:**

وەچە بەرهەمی نێوان ژن و مێردە کە خێزان دروست دەکەن، و منداڵیش دەبێتە هۆی دروست بوونی پەیوەندیەکی نوێ لەنێوان ژن و پیاودا، جاری وا هەیە مرۆڤ بیری بەلای ئەوەدا ناچێت کە ژیانی هاوسەری لەگەڵ مافی دایك و باوك دژ دەوەستێتەوە.

بەڵام لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەم دوو مافە رووبەڕوو بونەوە، کاتێك عومەری کوڕی خەتاب ﷺ داوای لە (عبدالله)ی کوڕی کرد ﷺ ژنەکەی تەڵاق بدات لە کاتێکدا مێردەکەی (عبدالله) خۆشی دەویست.

لەوکاتەوە زانایان ئەم باسەیان کردووە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجام داوە، بابزانین موسڵمان دەبێت چی بکات؟

سنوری چاکە لەگەڵ دایك و باوك چیە؟ ئازاردانیشیان مەبەست چیە؟ ئەگەر پەیوەست بوو بە کۆتایی هێنانی ژیانی خێزانی چی؟

لێرەدا دەبینین زانایان راستەوخۆ وتویانە کە لێرەدا بەگوێیان ناکرێت، مەگەر کاتێك باوکەکە کەسێکی لەخوا ترس و چاکەکار بێت، بەبێ ئەوەی باس لەوە بکەن کە ئایا سوننەتە بەگوێ کردنی یان نا؟

ئیبن تەیمیە باسی کردووە کە "قسەی ئیمامی ئەحمەد لە واجب بوونی تەڵاقی خێزان بە فەرمانی باوك پەیوەستە بە چاکی و دڵسۆزی باوکەوە" .

هەر ئیبن تەیمیە بە حەرام و قەدەغەی زانیوە کە کوڕ بە گوێی دایکی ژنەکەی تەلاق بدات، بەتایبەت ئەگەر منداڵیان هەبوو .

پرسیاریان لێکرد کە پیاوێك ژنی هەیە و منداڵی هەیە، دایکی رقی لە ژنەکەیەتی و دەڵێت ئەبێت تەڵاقی بدەیت، ئایا دەبێت بەگوێی دایکی بکات؟

لەوەلاّمدا دەڵێت: دروست نیە لەبەر قسەی دایکی ژنەکەی تەلاّق بدات، بەڵکو دەبێت لەگەڵ دایکی چاکەکار بێت، تەلاّقدانی ژنەکەشی چاکەکردن نیە لەگەڵ دایك. . . خواش زاناترە.

هەروەها لە پەڕاوی (الآداب الشرعیة) مامۆستا(تقی الدین) ـ رەحمەتی خوای لیّ بێتـ دەڵێت:

نابێت دایك و باوك داوا لە کوڕەکەیان بکەن کە ئافرەتێك مارە بکات کە خۆی نایەوێت، ئەگەر کوڕەکەش رازی نەبوو، مانای وانیە ئازاری دایك و باوکی داوە، ئەگەر کەس نەتوانێت بەزۆر شتێکی دەرخوارد بدات کە ئەو حەزی لێناکات، ئەوە لە بابەتی ژنهێناندا باشتر ناتوانێت.

چونکە خواردنی شتێك کە پێت خۆش نەبێت، ئازارەکەی ساتێکە، بەلاّم ژنهێنان بەزۆر (هەم لە روی کوڕ یان کچەوە) ئازارەکانی درێژە دەکێشێت. . .

هەروەها زانای گەورە حەنبەلی (البهوتی) بڕوای وایە کە کوڕ پێویست نیە بە گوێی دایك و باوکی بکات ئەگەر داوای تەلاّقدانی ژنەکەیان لێکرد هەرچەندە دادپەروەریش بن.

**پانزەیەم: عەورەتی دایکی ژن ( خەسوو ) بەنیسبەت زاواوە.**

**پرسیار:**

ئایا درووستە دایکی کچ رووبەڕووی مێردی کچەکەی ببێتەوە بە سەری رووتی؟

یان بە جل و بەرگی کورتەوە لە سەروی ئەژنۆ؟

یان لە ئامێزی بکرێت؟ یان وەك کوڕی خۆی ماچی بکات؟!

**وەڵام:**

دایکی ژن لە کەسە مەحرەمەکانی (مێردی کچ)ە و درووستە دەست و دەموچاو و سنگی و موی سەری و ئەم شتانە ببینێت، بەڵام ماچکردنی ئافرەت بۆ مێردی کچەکەی کەراهەتی هەیە لەئامێز گرتنی خراپە و درووست نیە، چونکە ئەوە تەنها لەگەڵ مێرددا دەکرێت، بەڵام درووستە سەری ماچ بکات[1].

---

[1] من فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية و الافتاء – ج١٧/٣٦٥ – رقم الفتوى: ١٧١٥٣.

## شانزەیەم: هەڵوێستم چی بێت لە ململانێی نێوان ژنەکەم و دایکم؟

"من پیاوێکی هاوسەردارم و سوپاس بۆ خوا منداڵمان هەیە، بەڵام دایکم و ژنەکەم لە یەکتر تێناگەن و کێشەیان هەیە و دایکم لە هەموو شتێکی خێزانیماندا قسە دەکات و نایەوێت بەنەرمی لەگەڵ هاوسەرم مامەڵە بکەم، هەمیشە بە خراپی باسی خێزانم دەکات، ناتوانم دایکم رابگرم، چونکە هەست دەکات من لە دژی ئەوم و من خێزانم خۆش دەوێت زیاتر لە دایکم، لەراستیدا خێزانیشم کەمێك کەمتەرخەمی و فەرامۆشی تێدایە، دایك و باوکم لە شوقەیەك دەژین و منیش لە شوقەیەکی بەرامبەریان، تەنها کوڕم و ناتوانم لێیان دوور بکەومەوە، پێویستە هەمیشە لێیان نزیك بم، ئەگەر دەرگای شوقەکەم داخست، ئەوە کێشەی گەورە روو ئەدات و هەستیان بریندار دەکەم، بۆیە زۆر گرفت و کێشە لەنێوان من و ژنەکەمدا هەیە کە زۆر جار گەیشتۆتە هەڕەشەی لێك جیابوونەوە، چونکە رێزی دایکم ناگرێت، جاری واش هەیە لەو

بڕیارە پەشیمان دەبمەوە، کە بیر لە منداڵەکانم دەکەمەوە نازانم ژیانیان و دوارۆژیان چۆن دەبێت، دووبارە بوونەوەی ئەم بارودۆخە وای لێکردووم کە خێزانم خۆش نەوێت و رقم لێی بێت، ئیتر نازانم چی بکەم؟

چۆن لەگەڵ غیرەتی دایکم مامەڵە بکەم؟

ئایا خێزانم تەڵاق بدەم و کۆتایی بە گرفتەکەمان بهێنم؟

ئایا ژنێکی تر بهێنم و بارەکە بگۆڕێ؟

. . . داوای چارەسەرتان لێ دەکەم . .

**وەڵام:**

ئازیزم بەداخەوە لەم رۆژگارەدا گرفتی زۆر لە نێوان دایك و ژندا روو دەدات، مرۆڤ نازانێت چۆن دادوەر بێت لە نێوانیاندا تا نەکەوێتە ستەمکردن لە یەکێکیان.

غیرەی دایکت لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە دەیەوێت دەسەڵاتی بەسەر دڵتدا هەبێت، قبوڵی خۆشەویستی کەسێکی تر ناکات، رەنگە خێزانەکەشت بە هەندێك هەڵسوکەوتی ئەم هەستەی لە دەروونیدا زیاد کردبێت.

**یەکەم: چارەسەری ئەو غیرەیە لای دایکت.**

هەمیشە وا دەربڕە کە خۆشەویستیت بۆی زۆر گەورەیە و خۆشەویستیشت بۆ هاوسەرەکەت جۆرێکی ترە و جیاوازە لە خۆشەویستی بۆ دایك، هەوڵبدە لەبەرچاوی دایکت گرنگی بە خێزانت مەدە تا بێزار نەبێت، و هەمیشە سۆز و خۆشەویستی بۆ دایکت دەربڕە.

**دووەم: دەربارەی خێزانت:**

ئاشکرایە کە خێزانیشت دەیەوێت تۆ بەتەنها بۆ ئەو بیت، بۆیە رەنگە هەست بە بوونی گرفت بکات لە نێوان خۆی و دایکت، بۆ چارەسەری هەڵوێستت لەگەڵ خێزانت، پێویستە چەند کارێك ئەنجام بدەیت.

١ـ پێویستە بزانیت و ئەویش ئاگادار بکەیت کە دروست کردنی کێشە و هەوڵی گۆڕینی تۆ بەرامبەر دایکت و خوشکت کارێکە خوا پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی رازی نین.

بۆیە پێویستە لە روانگەی ئیسلامەوە ئامۆژگاری بکەیت و ئەرکی سەرشانی بۆ رۆشن بکەیتەوە بەرامبەر دایك و خوشکت،

بۆ ئەوەی بە دڵێکی فراوان ئەو شتانەی دایکت قبوڵ بکات و هەوڵی دروستکردنی کێشە نەدات لەگەڵیدا، چونکە خۆشەویستیت بۆ دایکت جیاوازە لە خۆشەویستیت بۆ ئەو.

٢ـ لە نامەکەتدا هاتووە کە ژنەکەشت کەمتەرخەمە لە بەرامبەر مافی دایکت، پێویستە لەو کەمتەرخەمیە ئاگاداری بکەیتەوە، بە لەسەرخۆیی و هێمنی هۆشیاری بدەیتێ.

٣ـ ئامۆژگاری بکەیت کە گرفتی زۆر ماندوتان دەکات و کاری سلبی و خراپ لە خێزاندا بەرهەم دەهێنێ و ئەوەش کاریگەری خراپی لەسەر ئارامی خێزانەکەتان دەبێت.

٤ـ ئەگەر هەست دەکەیت هەندێك هەڵسوکەوتی دایکت و خوشکت دەبێتە مایەی بێزاری ژنەکەت دەبێت ئاڕاستەی ئەوانیش بە جوانی بکەیت.

ئەگەر وادەبینیت کە هاوسەرت گوێ بۆ ئامۆژگاری و ئاڕاستەکانت ناگرێت، ئینجا لەرێگەی کەسوکاری ئاگاداری بکەرەوە.

بەڵام دەربارەی جیابوونەوە (تەڵاق) من لەگەڵیدا نیم، بەتایبەت کە ئێوە منداڵتان هەیە، بۆ پاراستنی دوارۆژی ئەوان ئارام بگرەو هەوڵی ئامۆژگاری بدە.

جیابوونەوە یان ژنهێنانی تر چارەسەر نیە ، کارەکە پێویستی بە لێزانی و ئارام گرتن هەیە، ئینجا بزانە چاکەکردن و بەخشین و لێبوردنت لەگەڵیدا رەنگە ببێتە هۆی بەخۆدا چوونەوەی ئەویش، کەواتە تۆ ببە بە کەسێکی نمونەیی لەبەردەم هاوسەرتدا، فێری مانا جوانەکانی ئارامی و بەختەوەی بکە.

ئەگەر ژنەکەت هەست بە بوونی بۆشاییەك دەکات لە ژیانیدا، هەوڵبدە بەشتێکی سودبەخش ئەو بۆشاییە پڕ بکەرەوە، وەك خوێندن و کاری کۆمەڵایەتی و یارمەتی بێ نازان و نەخۆش.

متمانەت بە خوا هەبێت کە چارەسەری گرفتەکانت دەکات وکەش و هەوای ئارامی باڵ دەکێشێت بەسەر خێزانەکەتاندا، ئامۆژگاریشت ئەکەم هەمیشە دەم بە دوعا و پاڕانەوە بە، داوا لە خوا بکە رێگەت بەرەو راستی و کاری خێر بۆ رۆشن بکاتەوە.

## کۆتایی:

ئەمە گەشتێکی کورت بوو لەگەڵ پەڕەکانی ئەم کتێبە ئەنجاممان دا، ئەوەمان بۆ رۆشن بۆوە کە لە ئیسلامدا خێزان چەندە گرنگە، بەردی بناغەی دروستکردنی کۆمەڵگایەکی بەختەوەرە، پەیوەندی نێوان ژن و مێرد و خەسوو و خەزورمان بۆ ئاشکرا بوو، کە دەبێت پەیوەندیەکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستی بێت، بەوەش خێزان ئاسودە و کامەران دەبێت.

ئەوەشمان بۆ روون بۆوە کە هەریەك لە ژن و پیاو رۆڵی بەرچاویان هەیە لەئارامی خێزاندا، هەروەها خەسووەکان بۆ گەشەکردنی ئەو پەیوەندیە رۆڵیان گرنگە.

ئەوەشمان بۆ روون بۆوە کە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لەگەڵ خەسوو و خەزورانیدا چۆن مامەڵەی کردووە و چۆن لەگەڵ مێردی کچەکانیدا هەڵسوکەوتی کردووە، ئێمەش پێویستە بیکەینە پێشەوا و چاوساغی خۆمان.

هەروەها هۆکارەکانی گرفتی نێوان بوك و خەسوو و شوێنەوارە خراپەکانی و ڕێگەچارەی ئەو گرفتانەش ڕۆشن کرایەوە.

ڕەنگە زۆرتر سودمان لە هێنانی گرفتەکان و چارەسەر لە ڕێگەی پرسیار و وەڵام و نامەکانەوە بینیبێت.

داواکارم لەخوای گەورە هەموومان سەرفراز بکات و ڕێگەی ڕەزامەندی خۆیمان پیشان بدات.

و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

٢٠٠٩/٤/١٥

وەرگێڕ

ناصح محمد شارباژێری

سلێمانی ـ ڕاپەڕین.

# پێڕست